بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين الصلاة والسلام على خير خلقه محمد وعلى اله وصحبه واجمعين ..

سوپاس و پێ زانین ..

پێشەکی دەست خۆشی و دڵ خۆشی خۆم ئاراستەی خوشکە ئیلاف ئەحمەد غەزاڵی ئەکەم، ڕەبی دەستەکانی بەئاگری جەهەننەم نەسوتێ و خودا لەگەڵ فاطمة و عائشەی حەشربکات و ئێمەش بەکەرەم و لوتفی خۆی ببورێ .

بەڕاستی مەمنونی ئەم خوشکەم کە ئەم چاکەی لەگەڵ کردووم، بەنووسینەوەی دەقی وانەکان لەسەر کاغەز.

وەسوپاسی ئەم برایەش ئەکەم کە بەکۆمپیوتەری نووسیتیەوە، خوا بۆخۆی بەهەر پیتەك هەزارەها خێری بۆ بنوسێ..مەمنون و سوپاس بۆ هەر کەسێك کەیارمەتی بۆ بڵاوبوونەوەی قسەی چاك و خێر ئەدات.

براتان

مەلا شێرزاد

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

**خۆشەویستانم خۆشحاڵم کە بە ئێوەی خۆشەویست ئەگەمەوە، بۆ ئەوەی بتوانین هەر چۆنێك بێت، هەموومان هیمەتێك بکەین، بۆ ئەوەی زیاتر لەدینی خوا حاڵی بین وە زیاتر لەقورئانی پیرۆز شارەزا بین و زیاتر لەخواو پێغەمبەری خوا بچینە پێش و رەزامەندی وان بەدەست بێنین انشاء الله، لە خوای گەورە دەپارێمەوە دڵ و دەروونمان بەنووری خۆی منەوەر بکا، وەهەروەها بەرەکەت بخاتە ژیانمان بۆ ئەوەی زیاتر خزمەتی ئەو دینە بکەین و یارمەتیمان بدا خۆمان لەئاگری جەهەننەم بپارێزین، بەرەو رەزامەندی خواو بەهەشتی خوا برۆین انشاء الله.**

**ئازیزانم لەهەر مەجلیسێك دادەنیشین لەهەر کۆڕێك دائەنیشین یەکەم قسە کەئەکرێ ئەڵێن باشە بۆ وەزعمان تێکچوو، باشە بۆ واگۆڕاین، یەکێك بەرامبەرت دانیشتیە ئەڵێ باشە پێم سەیرە پانزە ساڵ پێش ئێستا، دەساڵ پێش ئێستا ئێمە وانەبووین، تەماشای هەر لایەکی ژیان ئەکەین دەبینین بەرەو خراپە چووینە، جا من پێم خۆشە بەوردی فکر لە لەگۆڕانکاری خۆمان بکەینەوە بابەش بەش پێدابچین، بۆ ئەوەی شارەزاییەك و چاو روونییەکی باشمان بۆ پەیدابێ لەو شوێنانەی کە گۆڕانکاریمان بەسەر داهاتووە، یەکەمین بابەت کە ئەمەوێت باسی بکەم، گۆڕانی ئێمەیە لەبواری کۆمەڵایەیی، یەکەمین بەش تەماشای خێزان بکە، بزانین چۆن گۆڕاوە کوا ئەو خێزانەی کە پێی دەڵێن خێزان، کوا رێزی ژن و پیاو بەرامبەر بەیەکتری، کوا وەفای پیاو بەرامبەر ئافرەت، بەپێچەوانەوەش، کوا وەفای**

منـدالآن بەرامبـەر بـەدایك و وكـان، كـوا وەفـای                                       وشـك
بەرامبەر خوشـك، رەحـم و بـەزەیی نـەماوە، وە (الله) بـرا متمانـەی بـەبرای
خۆی ناكا، برا یارمەتی برای خۆی ناداتن، برای لەبرسـان دەمـرێ دینـارێكی
لەدەست دەرنایێ، بەلآم بێگانەیەكی نەناسی هەزارو دوو هەزاری لەدەست
دەنـێ، خێـرو بەرەكـەتی بـۆ مـاڵی خـۆی نیـە، بـەلام خزمـەتی بێگانـە دەكـا
خزمەتی ماڵ و منداڵی خۆی ناكـا لـەماڵی دەڵـێ زەقنەبووتـە تـرش و تفتـە،
بەڵآم لەدەرەوە خەڵك هەر بەقسەی پێدەكەنی و هـەر خـوا خوایتیـان ئـەو،
لەمەجلیسەكەیان بێـت، چـونكە خۆشـی ئەداتـە مەجلیسـەكە ، بێینـە سـەر
دراوسێ كوا وەفای دراوسێ، كوا ڕاستی و وەفا بەرامبەر دراوسێ كـوا پـاكی و
بێگـەردی بەرامبـەر دراوسـێ ، كـوا دراوسـێ بەرامبـەر دراوسـێ ڕێـك مـاوە،
دەست پاك و ئـەمین مـاوە، بڕوابكـەن دراوسـێ بەرامبـەر دراوسـێ متمانـەی
نەماوە، خۆ ئێمـە (لەسـاڵی نـۆ وەدو یـەك) كەهـەلاتین بـۆ ئێـران و توركیـا!
یەكەم كەس كەتالانی كـردین جیرانـەكانی خۆمـان بـوون، ئـەوەش ئاشـكرایە
دەبوایـە محفوظـت بكـا ومـال و سـەروەت و كەرامـەت و شـەرەفت محفـوظ
بكـاتن، ئیمـرۆ یەكـەم جـار لـە جیرانـەكانی خـۆی ئـەمین نیـە، ئەترسـێ
لەزوبانی و لەدەستی و لەشەری، خۆ ئەگەر تەماشای دكتۆرەكان بكـەین كـوا
بەزەیی و ڕەحم، هەموو خەمی ئەوەیە ئیمڕۆ پەنجا فەحسی بكاو پارەكـەی
لەگیرفانی دابنێ و جانەوەی دێ موستەحەقە یـان موسـتەحەق نیـە كـەیفی
خۆیتی.

ئـەوەی دێ سـۆنەری دەوێ یـان نایـەوێ موشـكیلە نیـە، بـۆی بنووسـە، بـۆ؟
چونكە لەگەڵ كابرای سۆنەر شەریكە، بۆ ئەوەی قازانجی لێ بكا، یـەك رسـتە
دەرمانی بۆ ئەنووسێ، لەبـەر ئـەوەی لەگـەڵ دەرمانخانەكـە شـەریكە، روحـم
بەهیچ نەخۆشـێك ناكـا، كەئـەو نەخۆشـە هـەژارە، پـارەی نیـە، بـۆ ئەوەنـدە

فحوصاتی بکا؟ بەڵام دکتۆر گوێی ناداتی ، من ناڵێم هەموو دکتۆرەکان وان بەڵام زۆربەی دکتۆرەکان وەفاو وەفاداری و ڕاستگۆییان لەدڵی خەڵکیدا نەماوە..

خۆ ئەگەر بچینە ناو پارێزەرەکان، ئەو پارێزەرە هەر ئەسلەن فکر لە قەزیەکە ناکاتەوە، ئەو قەزیە حەقەیان ناحەقە، بۆ ئەوەی بەس پارەکەی پێ ببڕێ، قەزیەکە بایی هەزار دینار بێ، بەڵام ئەو سێ هەزاری لێدەستینی، ئەو بەندە قانونیەی کە محامیەکە چارەسەری موشکیلە کەی پێ دەکات، زولە و ستەمەو موخالیفی شەرعیشە گوێی ناداتێ ، بۆ ئەوەی قەزیەکەی بۆ خۆی بباتەوە و پارەکەی بۆ خۆحاصل بکاتن بیهاوێتە ناو گیرفانی، جا ئەمە کەی پارەیەکی حەلالە بەدەستیان ئەکەوێت، خۆ ئەگەر تەماشای موهندیسەکان بکەین، لا الە الا الله ، هەر موهندیسە و شەریکە لەگەڵ مقاول، جا ئەو مقاولە فێڵ دەکا لەعەمەلەکەی و ئەو فێڵ دەکا لەئیش، فێل لەکەسابەتەکەی دەکا موهیم نیە، پارە چاوی موهندیسەکەی کوێرە کردیە، هیچ نابینێ و موهیم ئەوەیە ئیمزای بۆ ئەکاو تەواو پارەی خۆی لەبنەوە لەگەڵ موقاولەکە وەردەگرێ و پەیوەندی بەنارێکی و بێ سەروبەری ئیشەکەش نیە، خۆ ئەگەر تەماشای موقاولەکان بکەین، مقاولەکەش لە موهەندیسەکە زاڵمترە.

ئەم موقاولە بەکەیفی خۆی ئەو ئیشانە دەکا، پارەی عەمەلەی دەخوا، پارەی سپیکار دەخوا، پارەی کاشی چی دەخوا، پارەی فلان و فیساڵ دەخواتن، بەکەیفی خۆی خیانەت دەکاتن لەئیشەکە، ئەو ئیشە کە دەکرێ بەشی یەك مانگ، ناکا هەموو نوقوستانیەکانی بەدیار دەکەوێ، بەڵام موشکیلە نیە ئەوە لە هەمووی موهیم ترە من ئەو ئیشەم گرتیە، بەو موقاوەلاتە کە گرتیتم من پێڕابگەم ، من ئەو جارە ئەو موقاولاتەم گرت،

دەبێ ئیلا (B.M) کی پێ بکرم هیچ عیلاجی نیە دەبێ فلان شتی پێ بکرم.

پێم سەیرە ئەو موهەندیسە، ئەو مقاولە چۆن بەدووئیش بوونە ملیۆنێرو دەولەمەند بوون، بۆ سەیری عەمەلەکان ناکەی، باگلەیی لەعەمەلەکان بکەین، عەمەلەکانیش ڕاستگۆ نەماینە لەئیشی خۆیان بە تەمەڵی و تەوەزەلی ئیش دەکەن، مافی ئیشەکە نادەن، ئەو پارەیەی کەوەریدەگرن بەحەلالی نیە، من باوکم وەستا بوو کاتی خۆی، عەمەلە بوویمە لەبن دەستی باوکم، خوا ئاگادرە هەتا یەك سەری هەموو بینایەکەی لێ نەدابا پشتی ڕاست نەدەکردەوە، وەستای ئێستا هیچ مەجبور نیە، چوار بلۆکان چوار بەردان لێدەدەن، نیو سەعات لەگەڵ عەمەلەکەی قسە دەکا، چارێکەك بینەو بەردەی دونیا باس دەکەن، کەی ئەمە رزقێکی حەلالی بە دەست دەکەوێت، عەمەلەکەش لەوەستاکە خراپ ترە، نیو سەعات خۆی دەشارێتەوە بەفێلی ئاو خواردنەوە، نیو سەعات خۆی مەشغول دەکا لەگەڵ ئەم و ئەو، قوربەسەر کابرای کە عەمەلەو وەستای گرتوە، نیوەی پارەی دەروا هێشتا نیوەی ئیشی بۆ نەکراوە، بۆ ئەگەر تەماشای مامۆستاکان بکەین، کوا راستگۆو وەفاو ئەمن و ئەمانەتی ئەم مامۆستایە، لەقوتابخانە مامۆستا گوێ ناداتە قوتابیەکان، گوێ ناداتە ئەو کەسانەی لەبن دەستی دەخوێنن، ئەسلەن ئەو زانستەی، لەلایەتی ئیهمالی کردوە ئەمانەتە، دەچێتە پۆل موهیم ئەومیە چل و پێنج دەقە بڕواو بێتە دەرێ، جائایا مادەکە شەرح دەکا بەچاکی و بەرێکی، قوتابیەکان تێ دەگەن یاخود نا موهیم نیە، مامۆستا دەچێتە ژوورێ چارێکەك بەدەنگو باس لەگەڵ قوتابیەکان دەباتە سەرێ، ئەڵێ چ هەبوو چ نەبوو، ئەمشەو جەزیرە و عەرەبیە و ابوظبی چیان گۆت! ئێ مامۆستا ئاوایان گوت و ئاوایان گۆت

ئـەوە چـارێگێك ڕۆیـشت، ئـەوجا پاشـان دێ چـوار وشـە لەسـەر تەختەكـە دەنووسـی، فـلان هەسـتە بخوێنـەوە ئـەویش دەخوێنێتـەوە نەماموٚسـتا نەقوتابیەكان هیچ تێنەگەیشتن و فێر نەبون، ئەمەكەی ئەتوانن نەوەیـەك پەروەردە بكەن، خۆ ئەگەر تەماشای قوتابیەكەی، بكەی ئەویش هەر خراپ ترە لەماموٚستاكەی، خۆ ئەو قوتابیە ئەسلەن قەدرو قیمەتی ماموٚستایەكەی لانیە، وادەزانێ ماموٚستاكەی موستەقبەلی فـەوتاوە كەبویتـە ماموٚسـتا، بۆیـە هـەوڵ دەدان ئـەو شـتانەی پـارە زۆرتـر پەیـدا ئـەكاتن ئـەو ڕێیانـەی كـەپێ گـەورە ئـەبێ زۆر بەئاسـانترو هـیچ خوێندەواریـشی نـاوێ، بـەلكو ماسـتاو ساردكردنەوەو پان كردنەوەی دەوێ، ئەو ڕێیەی دەگرێتەبەر بۆچی دەچێت شـازدە سـاڵان خـۆی مانـدوو بكـاتن هـەتا دەبێـت بەماموٚسـتا، كـە بـۆ خـۆی لـەفكری قوتابیەكـەی موسـتەقبەلی فـەوتاوە، بـەلكو موسـتەقبەلی خـۆی ئەیەوێ كەبۆ خۆی تەسەوری ئەكا، كەبەم شێوەیە بەكورترین ڕێگا دەگاتێ جا خۆشەویستانم ئەگەر قوتابیەك قەدرو قیمەتی خوێندنی لانەبێ، قەدرو قیمەتی ماموٚستای لانەبێ، چۆن فێـرە زانـست ئـەبێ، بۆیـە ئێـستا زانـست و زانامـان نـەماوە، بۆیـە قوتـابی ئیهتمـام بـە خوێنـدن نـادات، قوتـابی پـۆلی شەشەمی سەرەتایی بێنە، ئەگەر ناوی خۆی و باوكی و باپیری بزانێ بنوسێ باشە، مەمنونی خـوا بـن، بـەلام وەختـی خـۆی قوتـابی شەشـەمی سـەرەتایی بەشەشـەمی زانـستی و وێـژەیی ئێـستا هـەبوو ، كـوا ئـەو هـەموو ڕاسـتی و وەفایەی لەناو دڵی قوتابیەكان هەبوو لـەناو دلی ماموٚستایەكان هـەبوو، كـوا ئـەو هـەموو ڕاسـتی و ڕێـزو ئـیحترام ورێـك و پێكـی یـەی هـەبوو ئێمـە ماموٚسـتامان ئـەدیت حـەوت كـۆلان دوور دەكەوتینـەوە، لەترسـان خـۆی لێ بـشارینەوە، ئێـستا ئەسـلەن قوتـابی هـەر شـەرم لەماموٚسـتای ناكـا، ئەگـەر قوتابیەكە لەبۆی برواو بچێتە سەرێ، لەپێش ماموٚستای جگارە دەكێشێ و

لاقی لەسەر لاق دائەنیٚ، جاماموٚستا تەماشای قوتابی وابکا چوٚن خولقی دەمینیٚ دەرس شەرح بکا، کەی ئارەزووی ئەمینی، ئەویش ئەیکاتە فشەو کات بەسەر ئەبات، خوٚشەویستانم تەماشای سایەقەکان بکەین، ئەو سایەقانەی ئیش دەکەن کوا ئەدەب و ئەخلاق و ریٚك و پیٚکیان کوا وەفایان، هوٚرین و هوٚرین لاکەوەو ولاکوٚ، جویٚن پیٚك دان و دەست لیٚك دەردیٚنن بەسەر یەکترشکاندنەوە و چاولیٚك سوور کردنەوە.

ئەوەکەی ئەدەبی سیاقەتە (السیاقة فن وادب واخلاق) هەمووی جنیٚودان و هەڕەشە و چاو سوورکردنەوەو جەبهەیە، بەلکو سیاقەت پیٚناسەکەم گوٚریەوە، فەنی قوتار بوونە چوٚن خوٚم قوتار دەکەم لەو سەیارەی، جاکە سایەقیٚك بەسیٚ سەد دینار بەرتیل ئیجازەکەی بوٚ بیٚتەوە مالیٚ، چوٚن سەری هەزاری وەکو من وتوٚ لەسەر جادەی لەقوڕیٚ ڕاناکا، ئەسلەن هەر گویٚشی ناداتیٚ، کابرا فشەی پوٚلیسی هاتوچوٚ دیٚ، قور بەسەر هیٚندە تیشکی خوٚر لەسەری دەدا رەش هەلگەڕایە، کەس ئیحترامی ناگریٚتن، کەس گویٚ ناداتیٚ بەکەیفی خوٚیان دەڕوٚن، ئیٚمە هەموو پیٚکەوە بەستراوین، ئازیزانم ئیٚمە لایەکمان هەلٚەو ناریٚکی تیٚکەوت تاکو هەموو تەسبیٚحەکە دەسوریٚتەوە هەموو ناریٚکی تیٚدەکەویٚ، جابەڕاستی لەهەر سوچیٚکی ژیانمان تەماشا بکەین ئیلا دەبینین کوٚمەلیٚك گوٚرانکاری هەیە، پیٚش دەسالٚ پیش ئیٚستا وانەبوون، وە(الله) دزەکانمان بە ئەخلاق بوون، یەك لە ماموٚستایەکان، گویٚم لەوانەکەی بوو، ئەیووت چەند سالیٚك پیٚش ئیٚستا مەسەلەن ئەو کەنەیگیٚراوە پیٚنج شەش سالٚ پیٚش ئیٚستا گیٚراویەتەوە، دەیفەرموو زەمانی باب و باپیرانم، کابرایەك لەگەلٚ برادەریٚکی چوو بووە دزی پیٚکەوە لەچیٚشتخانە یەکیٚکیان خیاری دیتبوو، خیارەکەی خواردبوو، برادەرەکەی گوتی چیت کرد، گوتی خیارم خوارد، گوتی دەمادەم نمەکی ئەم مالەت کرد،

نـابی ئێمـه دزیەکـه بکـەین هاتنـه دەرەوە ، ئـەوە ئـەخلاقی دزان بـوو، دز بەئەخلاق بوو، ئێستا کوا قیەم و ئەخلاق ماوە، کـوا میـزان مـاوە، تەماشـای ئەو گەنجە بکە، بزانە هەموو غەمی ئەو گەنجە چیە، هەموو غەمی ئەوەیە بزانێ ئاخیر مۆدیلی پرچ تاشین چیە، ئـاخیر مـۆدیلی پـانتۆل چـیە، ئـاخیر مۆدیلی جل و بەرگ چیە، ئەوە چیە لەبەرت برام ئەوە چیە لەبەرت بـەس بـزانم، ئـەو سـەرو سـیمایە بـۆ کـوێ دەچـی بـرام، وە (الله)ی خـەلکی هـیچ هەسـارەیەك و هـیچ شـوێنێك بـەتۆ رازی نـین، ئـەوەچ مۆدیلەکـە ئـەتۆ هێناوتە، ئەوروپاش کە تۆ لەچاوی ئەکەیتەوە بەو شێوەیە نیە، ئەوانەی تۆ لاساییان ئەکەیتەوە فەوتاون، رێ لێ بزر بوون ئەسلەن بە خۆشیان نازانن چ دەکـەن، خـۆ تـۆ بەشـەری، کـورە تـۆ ئیمانـت هەیـە تـۆ موسـلمانیت تـۆ ئیمانداریت، چۆن تەقلیـدی ئـەوان دەکـەی خـۆ ئەگـەر گلـەیی لـە خوشـکان بکەین هەر لێ گەرێ، نازانم باسی چیان بکەم، توخوا ئەمـە شمەکـە لەبـەری دەکـەن، کـەی رەسـەنایەتی و کوردایـەتی ئێمـە ئـەو شمەکـەی قبـول کردیـە، توخوا هیچ ئینسانێك کە مروئـەتی هـەبێ کە پیاوەتی هـەبێ، چۆن قبـول دەکـا ئـەم شمەکـەی لەبـەر دایـك و خوشـکی دا ببینێـت، پـێم سـەیرە ئـەم خەلکە بـۆ گـۆرا، بـۆ یەکسەر بەچـەند سـالێك سـەدو هەشـتا پلـە سوڕاوە، ئەوەی قیەم بێ نـەما، ئـەوەی ئـەخلاق و ڕاسـتی و وەفـاو رێـك و پێکی بـێ لەناو خەلکی نەما..

ئەوە لایەنی کۆمەلایەتی، بابچینە لایەنی ئەخلاق ..کوا ئەخلاق کوا ڕاسـتی لەناو خەلك، کوا دلپاکی و داوێن پاکی و دەست پاکی و ئەمانەت و رەحمەت و شەفەقەت و سینە پاکی کـوان، ئـەو ئەخلاقـە جوانانـە کـوا تـەواضع، کـوا بەزەیی کوان ئەو قیەمانە کێوە چوون، بۆ لەناو ئێمـە بـوون بەهـەلم لـەناو ئێمـەدا نـەمان، کێـوە چـوون ئـەو ئەخلاقـە رەسـەنەی کوردایـەتی بـاب و

باپیرانمان کەهەیان بوو، خۆ ئەگەر تەماشای لایەنی کەسەبات و مەعاش بکەین، شەریك لەگەڵ شەریکی راست نیە، شەریك لەگەڵ شەریك خیانەتی ئەکا، هەموو غەمی دوکاندار ئەوەیە کە چۆن قازانج بکەم، ئەوەندە پارە بەدەست بهێنم، هەمووی هەزاران شتی خراپ دەفرۆشێ بەس خەڵك لێی بکرێ هەزاران فروفێڵی دەکاتن، وەلەمانگەکە ئێکسپایەرەکەشی رەش دەکاتەوە، دەیکاتە سەرمانگەکەی نوێ، بەس بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی رەواجی بدا، چەند شتی پیس هەیە لەدەرەوە کە قیمەتی نەماوە ، کەئێکسپایەر بووە، هەر ئەسلەن لەجێیان فرێ ئەدرێ دەیهێنن بە ئێمەی تاقی دەکەنەوە، ئەمەکوا ئەخلاقی تاجیران کوا ئەخلاقی کڕین و فرۆشتنمان، جا بەڕاستی پێم سەیرە لەناو هیچ مەعامەلاتێکماندا ڕاستی و حەلالی نەماوە کوا حەلال لەناو دۆلار فرۆشان، هەموو بەتەلەفۆن یەك دۆلاری لەگیرفانی، نیە، تەلەفۆن دەکا کاکە پەنجا وەرەقە بووە ماڵ، نیو سەعاتی تر ئەڵێ بۆم بفرۆشە، تۆ دۆلارێکت لە گیرفان نیە چۆن پەنجا وەرەقەی دەکەیتە ماڵ، دەبێ دەست بەجێ تەسلیمی بکەی، ئینجا ئەو پارە بۆ تۆ حەلال دەبێ سبحان الله، هەر شوێنێکی دەگرین لەکڕین و فرۆشتن زۆربەی حەرامە ناڵێم هەمووی بەڵام ئەغلەبی حەرامە، کەس نایێ پرس بەماموستا بکا..بڵێ مامۆستا گیان ئەو ئیشە چۆنی حەرامە و چۆنی حەلالە، نایکا کاتێك لەگەڵ کابرای شەریك توشی موشکیلە دەبی، ئەوجا دێتە لای مامۆستا، وە (الله)ی مامۆستا گیان کێشەیەکمان هەیە، مامۆستاش گوێرادەگرێ، دەفەرمووی کە باس دەکا لەسەرەتای ئیشەکەی بۆ گەنیە هەتا سەری، شتێك لەسەرەتاکەی بێ سەرو بەریت کردبێ، و بۆ گەنیت کردبێ ئەی چۆن شەرع بتوانی بۆت حەلال بکاتن، جا ئەو موشکیلاتە زۆر دێتەلای ئێمە، بەڕاستی سەرەتا پرسیار ناکەین، بەڵام کەتووشی موشکیلە ئەبن،

ئێنجــا دێ پرســیار دەکــاتن، خــۆ جــارێ گلــەیم لەئیماندارەکانــە، لەموســلمانەکانە، ئەوانــەی مولتــەزیمن ئــەوانیش تێکــەوتوون، ئــەوانیش تووشی ریباو بێ سەرو بەری لەکارەکانیانـدا هەیـە، خۆشەویستانم ئیمامی عومەر رەزای خودای لەسەر بێ، دەچووە باراز ئەیفەرموو: (ئەی خەلکی بازار ئەوەی لەفقهی بازار نەزانێ ئەوەی لە فقهی معاملات نـەزانێ بـەم دارە پشتی دەشکێنم، بانێتـە بـازار، نزیکی بازارمـان نەکـەوێ و خـەڵکی ئێمـە تووشی ریباو حـەرام نـەکا) کوا شارەزای شـەرحی موعامـەلات لـەناو ئێمـە لەبازاردا، هەر تەقەی سەری دێ، نەفس و هەواو ئارەزوو حوکم دەکا، لـەناو بـازاردا گـرنگ ئەوەیــە ئــەمن بگەمــە نــاو بــازارو دەولەمەنــدبم، بەهــەر شێوەیەك بەهەر حیلەیەك بەهەر قۆڵ برینێك بێ زۆر گـرنگ نیـە، بۆیـە خــوای گــەورە ســبحان اللە دەفــەرموێ ﴿وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْإِثْمِ ......﴾ المائــدە/٦٢، واتــە: هــەردەیان بینــی خــەڵك زۆربــەیان موسـابەقە دەکـەن بـۆ بەدەسـت هێنـانی حـەرام بـۆ خـۆ دەولەمەنـد کـردن لەسەر حیسابی من و تۆ، فلان و فیساڵ بەخۆشی بژی، بامن بمرم لەبرسان، جاخۆشەویستانم تەماشای کێنـدەرێی ژیـان بکـەن، تەماشـای چ قـوژبنێکی ژیان بکەم تێك نەچووبێ و نەفەوتابێ، باشە بۆ تەماشای سیاسـەت نەکـەین کواسیاسەتی ئیمرۆ ، هـەمووی درۆو دەلەسـەیە لـەبۆ خـەڵکی سیاسـی چیـە هـەمووی گورگاتیـە کـابرای مەسـئول هـەر دمیـەوێ گیرفـانی خـۆی پڕکـا، هەردەیەوێ بەزووترین کـات خـۆی دەولەمەنـد بکـا، سیاسەتیـشمان گـۆڕاوە، هەتاراستیشمان لە سیاسەت نەماوە، پیـاوی سیاسـی یـەعنی زۆر درۆزن، زۆر بێ سەرو بەربێ سیقە بێ وەفا بێ ئەمەك، ئەمە پێناسەی پیاوانی سیاسـیە، نەخێر وانیە ئەو چەند ساڵە گۆڕا، ئـەو چـەند سـاڵە وەی لێهات کـەپیاوانی

سیاسی وابن، بڕۆن تەماشای باب و باپیرانمان بکەن، کاتێ کە باسی یەکێکیان ئەکرد، ئەگەر بیان گوتایە کابرایەکی سیاسیە، یەعنی غەمخۆری ئەم میللەتەیە هەر شتێك ئەکا بۆ ئەوەی ئەم میللەتە بەرز بێ هەر شتێك ئەکا بۆ ئەوەی ئەم میللەتە بگاتە بەختەوەری، ماف و حەقی ئەو میللەتە چۆن بە دەست بێنیت چۆن شۆرش و خەبات بکا بۆ ئەوەی میللەتی خۆی بگاتە رەوای حەق، ئەما ئەوانەی ئێستا هەم و غەمی گیرفان پڕکردنەو سەیارەیەو خۆ قەلەوکردنە هەروەها خانوو دروست کردنە بەس ، ئەوانە نەما هەموو غەمی میللەتمە، بزانم میللەتم چی پێویستە، لەکێو ندەرێ دەنالێ، چی نوقوستانە ئینجا خۆشەویستانم بەڕاستی باسی هەموو موشکیلەکانی کۆمەڵگا بکەین تەواو نابێ، بەڵام ئەمە واقیعی حالەو دەبێ ئیعتراف بکەین، دەبێ هەموومان دەست لەسەر دەردەکانی خۆمان دابنێین بلێین مامۆستا ڕاست دەکەی ئێستا ئێمە ئەو هەموو دەردانەمان لێیە، ئەو هەموو گۆرانکاریەمان بەسەر داهاتیە، هەستیش پێ ناکەین، دەبێ پێش ئەوەی چارەسەری دەردەکە بکەی، دەردەکە تەشخیص بکە، ئەوکاتە نیوەی عیلاج تەشخیص کردنی دەردە من ئێستا زۆر بە پەلە بۆم باس کردن، ئەمە گۆرانێکە بەسەر ئێمە داهاتووە، ئەمە حالەتێکە بەسەر ئێمەی کورد داهاتووە، خۆ میللەتانی دەوراوپشتمان هەر لەئێمە خراپترن، بەڵام ئێمە ساحێبی خۆمانین و باسی خۆمان دەکەین، جامادام وابێ دەبێ فکر بکەینەوە پیاوی عاقل ئەبێ ئەوەی ڕاست و وەفادار و دڵسۆزە بەرامبەر میللەتی خۆی دابنیشی لەگەڵ دڵسۆزان فکر بکاتەوە، ئێمە چی بکەین بۆ ئەو میللەتە، ئێمە چۆن ئەو میللەتە حالی بکەین لەدینی خوا ، خۆشەویستانم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : من و ئێوە وەکو کابرایەکی وایە، ئاگرێکی هەلکردبێتەوە بیەوێ خۆی لەبەر گەرم بکاتەوە تەیرو

پەپولە و پەروانە هەن نازانن ئەو ئاگرە دەیسوتێنێ بەدەستی دەریان بکات، خۆ لەناو ئاگرەکە دەنێن ئەویش هەر ئەوەندەی ئەتوانێ بەپەپولەو تەیرەکان بڵێ توخوا بەدوور کەونەوە ئەو ئاگرە ئەتانسوتێنێ خۆشەویستانم ئێمە و ئێوە گشتمان دەبێ وەك ئەو پیاوە وابین ئەبێ دلسۆزبین بۆ میللەتەکەمان، بلێن خەلکینە ئاگاتان لە خۆبێ ئەوە بەرەو هەڵدێر ئەڕۆن، بەرەو کاول بوون ئەرۆن و بەرەو فەوتان ئەرۆن نالێم فەوتاون چونکە پێغەمبەر ﷺ نەهی لەئێمە کردووە بڵێین هەمووی فەوتاوین، چونکە خۆی فەوتاوە بەلام من ئەلێم بەرەو فەوتان ئەرۆین بەرەو کاولی ئەرۆین بەرەو بێ سەرو بەری ئەڕۆین وە (الله)ی بەختەوەری نیە، ئەوەی ئێمەی تێدابێ، بەختەوەری ئەوەیە دڵت خۆش بێ بەختەوەر ئەوەیە کامەران بی، پاك و ئەمین بی لەگەڵ خەڵك، سیقەو باوەر بەخەڵکی بکەی، خەڵکی سیقەو باوەڕت پێ بکا ئیماندار ئەو کەسەیە خەڵك لەدەست و زوبانت ئەمین بێ، ئەمە بەختەوەریەك و خۆشیەکە ئێمە دەمانەوێ، ئەبێ جیران لەجیرانەکەی تەئمین بێ، برالە برای وەفادار و بەزەیی بێ دایك بەرامبەر بەمنداڵەکانی بەروحم بێ، منداڵەکان خزمەتکاری فۆندەرەی دایك و باوکیان بن، برادەر لەگەڵ برادەر دەبێ وەفادار بی نەك قۆرتی بۆ لێبدا و تەقریری لەسەر بنووسی وسەری لەقور ڕابکا، کەسێك هاموشۆی کەسێك دەکا بۆ ئەوە نەچێ پشتی بشکێنی بۆ ئەوەی مەحبەت و ڕێزو ئیحترام لەگەڵ یەك پەیدا کەین، یەکترمان خۆش بوێ کەدەمەوێ تیجارەت بکەم بۆ ئەوەم نەبێ خۆم دەولەمەند بکەم، ئەمن بمەوێ شتێکی چاك بۆ ئەو میللەتە بهێنم دوو دیناریش بۆ خۆم قازانج بکەم چی تێدایە، ئەبێ ژیان وابێ دەی کەواتە ئێمە ئێستا بەپەلەو زۆر بەکورتی و بەکوردی گەراین بەناو هەموو کۆمەلەکەماندا بەهەموو کۆمەلگا و بەهەموو

کۆمەڵانی خۆماندا هەر یەکێ موبتەلایە بەدەردێ هەریەکێ موبتەلایە بەکۆمەڵێك مەشاکیل و غەم و پەژارەیەك باشە ئەو گۆرانە لەکوێ رویدا حەتمەن کە تەماشای خۆمان دەکەین خۆمان گۆریتمان مانگ و ئەستێرە و دارو بەرد و ئاو نەیان گۆڕیوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾﴾ الانفال/٥٣ واتە: بزانە یا محمد ﷺ با ئومەتەکەشت ووشیار بێتەوە بزانێ خوای گەورە کاتێ نازو نیعمەتێك ئەداتن بەکەسێك وکۆمەڵێك لێان ناگۆرێ ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ۙ﴾ هەتا بۆ خۆی نەیگۆڕن، هەتا لەو خۆشیەی تێدانیە لێیان بێتە ناخۆشی، هەتا بەدەست و زوبان و چاویان خۆیان نەی گۆرن خوای گەورە لێیان ناگۆڕێت پاشان خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ الرعد/١١، واتە: خوای گەورە لەهیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ، لەهیچ کەسێك و قەومێك و میللەتێك تێك ناداتن هەتا بۆ خۆیان لەخۆیان تێك نەدەن، کەواتە ئێمە بەخۆمان لەخۆمان تێك داوە..دەبا بێین تەماشای خۆمان بکەین بزانین هەڵەکە لەکوێندەرێیە مادام ئەمن بۆ خۆم قاتیلی نەفسی خۆمم، من بەخۆم خۆم کوشتی یە خۆم فەوتاندیە، خۆم گۆریوە خۆم بەهیلاك داوە، دەبێ بێم عەمەلیاتی جەراحی بۆ خۆم بکەم ئەبێ بزانم کوێندەرێ تەئسیری هەیە لەسەر من، کێ قیادەی

من دەکا، دەستم چاوم دەمم لوتم کوێندەرێ قیادەی من دەکاو بەرەو کاولیم دەبا، هەتا بیگرم دوو ئامۆژگاری بکەم پێی بڵێم کاکە بەرەو کوێم دەبەی تۆ بەرەو چ کاول کاریەکم دەبەی، جا حوشەویستانم کاتێك کەلەئینسان ئەکۆلینەوە، کاتێك ئینسان شەق شەق ئەکەین و تەماشای ئەکەین دەبینین ئینسان دوو بەشە مرۆڤ لەدوو بەش پێك هاتیە، لەکۆمەڵێك ئەندام، وەکو دەست و سەرو لاق و زگ و مەعیدەو دڵ ئەمانەش لەخۆل دروست بوونە، ئەوانەش هیجیان بە دەست نیە، هەموویان ئیش دەکەن بەغەیری ئیرادەی خۆیان بەشتێکی تریان نادیارن وەکو عەقل و نەفس و هەواو روح..ئەو چوارەیان لەگەڵ لاشەکەیان تێکەلاون، ئینسانێکیان دروست کردیە ئەو ئینسانە و لاشەیە هیچ تەحەکوم ناکا بەگۆرانەکەی، بەلکو ئەوەکەی دەیلێم ئەو چوارە ئەوانە تەحەکوم بەگۆڕان دەکەن لەو چوارە زائدەن روحیشیان ... عەقل و نەفس و دڵ و هەوا ئەو چوارە ئینسان ئەگۆڕن، ئەو چوارە ئینسان بەرەو باشە ئەبەن، یان بەرەو خراپە ئەبەن کەواتە لاشەمان لەگەڵ روحمان عیلاقەی بەگۆرانەوە نیە بەلکو ئەو لاشەمان دوو نەوعە حەرەکەی تێدایە، حەرەکەیەکی ئیختیاریە وەکو دەستم بەخۆم دەیجولێنم وەکو زمان بۆ خۆم قسەی پێدەکەم چاوم بۆ خۆم ئەی توروکێنم، گوێم بۆ خۆم گوێی لێ رادەگرم، بەلام هەندێکیشیان حەرەکەیەك و جولانێکی غەیری ئیختیاری تێدایە، وەکو لێدانی دڵم و هەناسەدانم وەکو ئەو حەرەکانەی ئەو شتانەی لەژوورێ دان لەناو لەشەمدا ئەوانە هیچ بەدەستی من نینە، بەلکو خوای گەورە وای کردوە بۆ خۆیان ئیش بکەن، جا ئینسانەکە بیەوێ یان نەیەوێ من بنوم یان بەخەبەربم، کۆ ئەندامی هەناسەدانم ئیش دەکا دڵم لەجێی خۆی هەر لێ ئەدا روحەکەش هیچی لەدەست نیە بەلکو تەزوێکی کارەبایە سری حەیاتە، خوای گەورە دایتیە

نێمـه، ئێمـه ئـەجولێنی، وەهـەروەها حەرەکـەو جولانـەوەی ژیانمـان پـێ دەبەخشێ هەر کاتێ خوای گەورە ئـەو روحـەی لـەو لاشـەیەجودا ئەکاتـەوە ئەو ئینسانە دەمرێ هیچ حەرەکەو شوێنێکی ئیش ناکا، نەچاوی نەعـەقلی نـەدڵی نـەزوبانی نـە دەمـی هـیچ ئەنـدام و هەسـتێکی ئـیش ناکـاتن .. دەی کەواتە ئەم روحە زۆر لەزانایان لێیان پێچایتەوە هەتا جولەکەکان هـاتن لـە پێغەمبـەری ئێمـە پرسـی ﷺ خـوای گـەورە جـوابی دانـەوە فـەرمووی ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ ۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ ﴿٨٥﴾ الاسـراء/٨٥، واتـە: یـا محمـد ﷺ لـەروح لێـت ئەپرسن بڵێ روح ئەمری خوایە وەکەسیش نازانێ روح چیە ﴿وما اوتيتم من العلم الا قليلا﴾ بەڕاستی ئـەی بەشـەر، ئێـوە لەزانـست ئـیلا کـەمێکی زۆر کەمتان پێ بەخشراوە..جا بەڕاستی زانایان وەکو ئیمـامی غـەزالی و جۆرانی تر زۆر زۆریان پێچاوەتەوە لەروح کە شوێنەکەی لەکوێیە هەتا هەنـدێکیان دەڵێن روح لـەناو دڵی دڵە، دەڵێن ئـەو دڵەی لای چـەپماندایە، دەفـەرموون دڵێکی کەی لەناو دایە روحەکەش لـەناو ویـە، جـا دەلیلیـان چیـە؟ دەلیلیـان ئەوەیە دەڵێن هەر ئەندامێکی ئینسانی لێبکەوە نامرێ، بەڵام وەرە ئەم دڵە لێبکەوە .. ئەو ئینسانە ناژی و ئەمری، بەڵام ئەمەش وانیە، جا ئەگەر ئـەو دڵە لێکەیتەوە دڵێکی دیکە تێبێخی ئەو روحە هەر نارواو هـەر دەمێنێـت و الله اعلم، ئەوە هەر خوا بۆ خۆی ئەزانێ چونکە خوا بـۆ خـۆی دەفـەرموێتن ﴿وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتـە: ئێـوە لەمەسـئەلەی روح لـەزۆر مەسـائیلەکانی تـردا زانـستێکی زۆر کـەمتان پـێ بەخـشراوە، ئـەوەش غەیبە هەر خوا بۆ خۆی ئەزنێ، جا کەواتە ئەم روحـە لەگـەڵ ئـەم لاشـەیە

ئەوانەیە یەکتری ئەگرن هەتا حەرەکەیەك و جولانێك و شتێك بۆ ئەو ئینسانە دروست بکەن، دەی کەواتە ئەوەی ئینسان دەگۆڕێ ئەوەی مەنهەجی ژیانی دەگۆڕێ ئەوەی رێی دەگۆرێتن یان بەرەو باشەی دەبا یان بەرەو خراپە، چوار شتن یان عەقلیتی یان دڵیتی..یان نەفسیتی، یان هەوایەکەیتی ..جا خۆشەویستانم بەپشتیوانی خوای گەورە لەو دەرسانەی داهاتوو یەك لەدوای یەك لەمانە باس دەکەین و وە هەروەها یەك یەك چارەسەریان بۆ دادەنێین ئەگەر عەقل تێك چوو، یان دڵ تێك چوو، یان نەفس و هەوا خراپ بوون، ئەوانە چۆن چارەسەر دەکرێن چۆن بتوانین ئەوانە محکوم بکەین.. بەرەو باش و رێك و چاك و پوختی ببەین، تاکو دەرسێکی تر بە خوای گەورەتان دەسپێرم.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

ئازیزانم ئێمە لەدەرسی یەکەم، ئەم زنجیرە باسەی کەبۆم ئامادە کردبوون، باسی گۆڕان و بێ سەرو بەری حاڵم لەهەموو شەرائیحەکان دا کرد، گەیشتینە ئەو نەتیجەی کە ئەو گۆڕانە بۆ خۆمان دروستمان کردووە، ئێمە بووینە سەبەبی ئەم گۆڕانە و هەر ئەبێ بە خۆشمان چارەسەری بکەین، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ واتە: خوای گەورە لەهیچ کۆمەڵێك ناگۆڕێ هەتا بەخۆیان نەیگۆڕن.

وە ئیمامی مالیك ڕەزای خوای لێبێت دەفەرموێ ( لايصلح اخر هذه الامة الا بما صلح اولها) واتە: چۆن بیدایەتی ئەو ئۆمەتەی چاك بوون و ڕێك بوون بەم شێوەیەش ئەو ئۆمەتە چاك دەبێ و ڕێك دەبێ، ئێمە ئەو ئۆمەتەی کەوا ئەژین وا ژیان ئەبەینە سەر، بەڕاستی خراپەکاری و بێ سەرو بەریو بێ شەرعی و شتی نارێکمان زۆر لەناو پەیدا بووە وەهەروەها گوتیشمان دەبێ چەند شتێك وا لە ئینسان بکا بیگۆڕی، یان ئەوەتە عەقلی یان دڵی یان نەفسی یان هەوایەکەی بێ، وە گوتمان چ لاشەی ئەو ئینسانە چ روح ئەوانە پەیوەندیان پێوەنیە، بەڵکو ئەو روحە وەکو تەزوێکی کارەباییە دێتە ناو لاشەکەی، وەحەرەکەیەك و وزەیەك و تاقەتێك ئەداتە ئەو ئینسانە پێی ئەژی و گوێی لێ ئەبێ و ئەبینی و هەست پێ ئەکاو ئەوانە هەموو ئیشی بەروحەوە هەیە، ئەو ئینسانە هەست پێ ئەکا، بەڵام جاری

یەکـەمیان باهـەر یـەکی لەمانـە چ دڵ و چ عـەقڵ و چ نـەفس و چ هـەوا، بانەزرەیـەکی کورتیـان لەسـەر وەربگـرین یـەك لـەدوای یـەك پێناسـەیان بکـەین، وە لێیـان شـارەزا بـین و بـچینە ناخیانـەوە ئینجـا تەشخیـصی هەریەکەیان بکەین بزانین ئەوانە بـە چ چاك ئـەبن و رێـك و رێـك و پێـك ئەبن.

**یەکەمیان** عەقڵ گەورەترین نیعمەتی خوای رب العالمینە بۆ ئینسان، ئینسان بەو عەقڵە لەهەموو کائینات جودا ئەبێتەوە، بەسایەی ئـەم عەقڵـە لـەباقی هەموو بونەوەر جیا ئەبێتەوە، ئەو عەقڵەوا لەئینسان ئەکات کەفکر کاتـەوە لەعەواقیبی خۆی، وە فێـری ئـیش بـێ وە مـەعلومات وەربگـرێ، شـت هـەزم بکاتن و شت لێك بداتەوە و فێـرە زانـست و زانیـاری دەبـێ، وەپاشـان رەبتـی مـەعلومات لـەناو زاکـیرەدا زەبتیـان دەکـات، تـەرتیبیان دەکـات، پاشـان زاکیرەیەکی بە قـوەتی هەیـە لەگـەڵ حافیزەیـەکی بـەقوەت کەیارمـەتی ئـەو عەقڵە ئەدەن کەئیشەکانی خۆی زۆر بەتێرو تەسەلێ و رێك و پێکی ئـەنجام بداتن، بەڵام لە غەیری ئینسان لەحەیواناتـەکان نیـە تـەنیا هەسـتیان هەیـە بەو هەستە شعور دەکەن، بەڵام وەکو عەقڵ نیتیان.

لەبەر ئەوە مـەعلوماتی پێـشوویان نیـە وە زەبتـی مـەعلومات نـاتوانن لـەناو مێـشك و دەمـاغی خۆیـان بکـەن، وەگـەورەترین شـتیش لـەناو عەقڵدا فکـر کردنەوەیە، جا بەڕاستی ئینسان بەفکر کردنـەوە دەگـات بەزانـست بـەناوات بەنەتیجـەو ئـەنجامێك کـە ئەتـەوێت پـێ بگـەیت، بـەڵام لەغـەیری ئینـسان لـەباقی حەیواناتەکانـدا ئەمـە نیـە فکـر کردنـەوەی نیـە فکـر لـە عاقیبـەتی خۆی ناکاتەوە ئەمـە ئـەخوا بـەڵام چـی بەسـەر دێ ئەمـە فکـر لێ ناکاتـەوە، تـەنها بـە هەسـت جـار بـەجار حـەیوانات هەنـە زیـرەکن هەسـت دەکـەن، ئەمەش وەکو فکر کردنەوە نیتیان، جا ئینـسان ئـەم فکـر کردنـەوەی هەیـە

بەڕاستی زۆر گەورەیە کە خوای گەورە دایتیە ئینسانی کەفکر بکاتەوە، بزانن سێ جۆرە فکر کردنەوەش هەنە، دەبێ ئەمەش ئەوە بزانین هەر چەندە پێم خۆش بوو بزانن زانایان زۆر زۆر بەحەسیان لەسەر نووسیوە هەتا هەولیان داوە عەقل بناسن کەئەو عەقلە چۆنەو وە پێناسەی چیە، هەتا هەندێکیان دەڵێن عەقل مەجموعە تەجاروبێکی (حەیاتیە یومیە)، مەسەلەن کابرایەك ئەبینی تێئەکەوێ بەکارێکدا، یەکسەر ئەتۆ فکر ئەکەیتەوە، عەقلت پێت ئەڵێ ئەو ئیشە مەکە ئەگەر نا عاقیبەتی تۆ ئەوە دەبێت، جا ئینسان چەند گەورەتر بێ تەمەنی عەقل و تەجاروبی حەیاتی زۆر تر ئەبێ، بۆیە پێی دەڵێن پیاوێکی عاقلە دونیا دیتەیە بۆ تەجاروبی لەپێشەی خۆی کە دیتیتی و گەڕایەو سوڕایە و خەڵکی دیتیە تفتی و تاڵی و ترشی و سوری گەرمی و ساردی زۆری دیتیە لەو حاڵەتەدا ئەو تەجروبانەی ژیانی هەمووی بوونە عەقل بۆی، بۆیە کەپرسی پێ ئەکەی رێیەکی زۆر جوانت پێ نیشان ئەداتن، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ (ماخاب من استشار) واتە: کەسێك پرس بەخەڵکی بکا بەسەر گەردانی و نائومێدی ناگەڕێتەوە، بۆ؟ چونکە کۆمەڵە عەقلێك لەعەقلێك باشترە، جاری وا هەبووە موعجیب بوینە بەبیرو هۆشی خۆمان، بە عەقلی خۆمان بەڵام کە ئیشەکەمان کردیە دیتمان ئەسلەن فکر دەکەینەوە هەر دەرکی مەسائیلەکانیشمان نەکردیە، زۆر بەبێ سەرو بەری، چۆن قەزیەکەمان فکر لێ کردیتەوە، دەی کەواتە پرسینی کەسانی تر واتە وەرگرتنی تەجروبەی غەیری خۆمان، بەڕاستی ئەمەعەقل زیاد دەکات، جائینسان چەند تەمەنی گەورەتر بێ، چەندی بگەرێ چەند تەجاروب ببینێ، چەند لەناو تەبەقات بژیی، لەگەڵ دەولەمەندان و سەرۆکان لەگەڵ ئەوانەی خوارێ و کاسبکاران

بژی، ئەوا ئینسان عەقل و مەدارکی عەقلی زیاتر ئەبێتەوە، جا ئەو عەقلە فکر دەکاتەوە، وەسێ جۆرە فکر کردنەوەش هەیە،

1) فکر کردنەوەیەکی رووکەشی (سطحی) هەیە.
2) فکر کردنەوەیەکی قوڵمان هەیە واتە عمیق .
3) فکر کردنەوەیەکی (مستنیر)مان هەیە.

**فکر کردنەوەی سطحی** وەکو زۆربەی خەڵکی کە فکر دەکەنەوە شتێکی طبیعی یە، هەر مەسەلەیەکی دێتە پێش بەسادەیی مەسائیلەکان فکر دەکاتەوە خەبەرەکی دەبیستی یان شتێك روئەدا زۆر بە سطحی و بەساکاری و تەبیعی فکر دەکاتەوە، **بەڵام جۆرە فکر کردنەوەیەکی ترمان هەیە کە پێ ی دەڵێن (تفکیر عمیق)** ئەوا ئەو کابرایە وا بەسادەیی فکر ناکاتەوە، بەڵکو زۆر بەقولی لە هەموو گرێیەکان و سەرەداوەکان فکر دەکاتەوە، وەپاشان خەبەرێك دەبیستی شتێك دەبینێ روداوێك دەبینێ دەزانێ ئەو روداوە لەو گۆرە روینەداوە خەلفیاتێکی هەیە، لە خەلفیاتەکەش دەکۆڵێتەوە، تا تێدەگات یەکسەر دەزانێ ئەو رووداوە بۆ روویدا ئەوە تەفکیری عەمیقە، ئەو تەفکیرە ساحێبەکەی دائیمەن پیاوی زاناو بەرزن پیاوی عاقلن، بەڕاستی ئەوانە زۆر فکر لەشت دەکەنەوەو زۆر بەقولی و دورو درێژی و زۆر بەرێك و پێکی دەچنە ناو مەسائیلەکان، **فکر کردنەوەیەکی ترمان هەیە کە پێی دەڵێن (الفکر المستنیر)** فکر کردنەوەی مستنیر ئەوەیە، تۆ بۆ هەدەفێك و ئامانجێك فکر بکەیتەوە، نەك بۆ شتێکی سادە فکر بکەیتەوە، جا هەموو فکرێکی مستنیر فکرێکی عمیقە، بەلام هەموو فکرێکی عمیق فکرێکی مستنیر نیە، ڕاستە کابرا بەقولی فکر دەکاتەوە بەڵام بۆ هەدەفێك فکر دەکاتەوە، بۆ مەقسەدێك فکر دەکاتەوە، بەڵکو هەر بۆ خۆی پیاوێکی ئاوایە، بەشتی ساویلکە و شتی ساکار

قەناعەتی نایە و دڵی ئاو ناخواتەوە، بەلکو دەبێ زۆر بەوردی بچێتە ناو بابەتەکان، بەڵام فکری مستنیر ئەوەیە تۆ هەدەفێکت هەبێ، تۆ بتەوێ کارێك ئەنجام بدەی نەتائیجێك بۆ خەڵکی بەیان بکەی جا ئەو فکر کردنەوەیە فکر کردنەوەی زانای فوقەهائەکان ئەوانەی ئیستینباتی ئەحکام ئەکەن ئەوانەی فکر دەکەنەوە کەچۆن بتوانن ئەو میللەتەیان لەقیمەی خۆشی و کامەرانی و بەختەوەری بژین، جا بەڕاستی جۆری سێیەم لەم فکر کردنەوەیە زۆر پێویستە کەئێمە هەمان بێت ئێستا ئێمە نەقوستانیمان هەیە، ئێستا یەك لەنەخۆشیەکانی ئێمە ئەوەیە فکر کردنەوەمان سادەیە دەنگوباس دەبیستین، ئەسلەن فکر ناکەینەوە، بۆ نموونە کابرایەك لەشوێنێکەوە دەچێتە شوێنێك باس دەکرێت لەدەنگوباس دەبێ فکر بکەیتەوە ئەو چوونەی حەتمەن سەبەبی هەیە بۆ چووە خەلفیاتی دەبێ چ ئاوات و هەدەفێکی هەبێ، لەو چوونەی یەکسەر کە فکرت کردەوە مەعلوماتی سابقەشت هەبوو، یەکسەر ئەتۆ دەگەیتە قەناعەتێك و لەهەدەف دەدەی، بەڵام ئەگەر وەکو شتێکی سادەو هاکەزایی بەمێشکت دەبێ وەکو خەبەرێك ببیستی بەڕاستی هیچ لەدەرکی ئەسراری ئەو بوونەوەر و ئەو ژیانە هیچ تێنەگەی، جا عەقلیش دوو جۆرە، جۆرێکمان هەیە

١) **عەقلی طبیعی** یە کە خوای گەورە ئەیداتێ، جا هەیە هەر بۆ خۆی لەزگ ماکی کە خوای گەورە دایتێ، عەقلێکی تیژو بەقوەت و وەرگرو تێگەیشتوو زوو شت تێدەگا، دەرکی کار دەکاتن زوو فێرەکار دەبیتن، عەقلێکی ترمان هەیە.

٢)**عەقلی اکتیسابی**، ئەو کابرایە بەخوێندنەوە بەتەجاروب و بەخۆماندی کردن و بەگوێ دان و بەتەماشاکردن بەوانە فێر دەبێ، هەموو خەڵکی ئەو

ئەدەواتانەی فێـر بوونیـان هەیـە، بـەلاّم کـەم کـەس دەتـوانێ ئیـستفادە لـەو پێداویـستیانە بکـاتن، جابەڕاسـتی ئینـسان چـەند ئیهتمـام بـەخۆی بـداتن، چەند فکر بکاتەوە چـەند زانـست و زانیـاری کـۆ بکاتـەوە، مـەدارکی عـەقلی زیاتر ئەبیتن، چونکە زانایـان ئەفـەرموون عـەقل بـە سایەی پێـنج شـتەوە مـەعلوماتی بـۆدێ وەکـو پەنجـەی دەسـت پێناسـەیان بـۆ کردیـە، ئـەلێن بەسـایەی چـاوی و بەسـایەی گـوێی و بەسـایەی لەمـسی و بەسـایەی ذوقـی.. بەسایەی ئەو پێنج شـتە مەعلوماتـەکان دێتـە شـوێنێك پێـی دەلێن (حـسی مشترك) لەو حسی مشترەکە چەند مـەعلومات زۆر بـچێتە ژورێ ئـەو حـسی مشترەکە زیاتر دەبێ و عەقلی ئەو ئینسانە فراوانتر و رێك و پـێ تـر دەبـێ، جا ئێمە یەك دەردمان هەیە ئەو حسی مشترەکەمان نوستوە، دەبینین کـابرا واتەماشای یەکێك دەکا بەلاّم بلێ فلان منت بینی، دەلێ نـاوەالله بـۆ چـونکە حسی مشترەکی مشغول بووە.

کابرایەك واقسەت بـۆ دەکـا، دەلێ توخـوا چیت گـۆت، ئـەی بابـە قـسەم بـۆ نــەکردی لــەکوێ بــووی وە الله حــسی مــشترەکی ئــەو کابرایــە مەشــغولە، جابەڕاستی ئـەو ئینـسانە چـەند بیرتیـژو بـەزەین و فکـری بـاش بـێ چـەند وردو لەسەر خۆو هێمن بێ، ئەوەندە ئەو ئینسانە عەقل و مەدارکی عـەقلی زیاترو بەقوەت ترو فراوانتر دەبێ، جا ئەو عەقلـە جێـی تـەکلیفی واجبـاتی (رب العالمین)ە کەسێك کە عەقلی هـەبێ واجباتیـشی لەسـەر واجـب دەبـێ چ واجبات چ حقوق وماف، هەمووی لەسەر دادەندرێت دەبـێ ئـەنجامی بـداتن، بـەلاّم هـەرکاتێ عەقلەکـەی نـەما، ئـەو واجبانـەی هـەمووی نـامینێ هیـچی لەسـەر موکەلـەف نـامینێ بۆیـە دەبیـنین شـێت و منـدالْ ئەوانـە هیـچیان لەسـەر واجـب نیـە، وەکـو نوێـژو رۆژو ئـەو واجباتانـەی کـە خـوای گـەورە لەسەر ئێمەی داناوە.

جابەڕاستی چەندی ئینسان زیرەك و بلیمەت بێ، حقوق و واجباتەكانی لەسەری پەیت ترو توندترو قەیم ترو زۆر تر ئەبێ، چونكە ئەو زەكاوەتە ئەم عەقلە تیژە زیاتر وەی لێدەكات، موكەلەف فكربكاتەوە زیاتر بەرهەم دار بێ و خێرو مەنفەعەتی لەبۆ خەڵكی هەبێت جا ئەو عەقلە بەتێگەیشتن دەولەمەند دەبێ.

تێگەیشتن ئەو زانستەیە كەئینسان دەستی دەكەوێتن بەسایەی خوێندنەوە و بینین و بیستن بەو شتانە بەدەستت دەكەوێ، رۆژ بەرۆژ ئەو مەعلوماتانەی بەدەستت دەكەوێ هەموو دەبێت بەمەفاهیم لەناو مێشكتدا ئەو مەفاهیمانەی كەلەناو عەقلتن تەئسیر لەسلوكت دەكا، سلوكی تۆ تەسەروفاتی تۆ جولانی تۆ بەرامبەر خەڵكی، ئەوە هەموو ئەو مەفاهیمەیە كە لە ناو عەقلتە وات لێدەكاتن، پیاوێك دێت لەبەری هەڵ دەستێتەوە رێزی دەگرم و تەقدیری دەگرم لەبەرچی، چونكە مەفاهیمێك لەناو دەماغ و مێشكمان پێم ئەلێن، دەبێ رێزو قەدری ئەو پیاوە بگریت، چونكە خاوەنی ئەو ئیشەیە،مرۆڤێكی بەحەیایە بەشەرەفە داوێن پاكە، یەكسەر ئەو مەفاهیمانەی وا لەسلوكی دەكا كە سلوكی باش بێ ئیشی لایەق بەرامبەری ئەنجام بدا.

بەڵام خوا نەخواستە ئەگەر مەفاهیمێكی نارێكمان هەبوو بەرامبەر هەر كەسێك سلوكەكەشمان نارێك دەبێ بەرامبەری، رێزی ناگرم، بەدەمی پێناكەنم، نسحەتی ناكەم، لەخۆمی نزیك ناخەمەوە، لەگەلیشی ناگەرێم بۆ ، چونكە ئەو مەفاهیمانەی لەناو مێشكن ئەمر دەكا بەسلوكم كەتۆ باش مەبە لەگەڵ ئەو كابرایە، رووی مەدێ هەلسو كەوتت باش نەبێ لەگەڵی لەبەر ئەوەی كابرایەكی خراپە دزە زمان پیسە، هی ئەوەی نیە لەگەڵی دانیشی و هاموشۆی بكەی و برادەرایەتی لەگەڵ بكەی، ئەو مەفاهیمە

یەکسەر سلوکم دەگۆڕێ بەرامبەر ئەو ئینسانە، ئێستا ئەوە پێناسەیەکی پوخت و جوانی عەقلمان کرد، زانیمان تەئسیراتی ئەو عەقلە لەکوێندەر دەبێ، وە لەکوێندەر ئەو عەقلە مورشیدی تۆ دەبێ، چونکە عەقل مورشیدە ڕێ بە ئینسان دەدا، حەق و ناحەقی بۆ جودا ئەکاتەوە، تاریکی و ڕوناکی بۆ جودا ئەکاتەوە، ئەو شتانەی پێویستی بەجودا کردنەوە هەبێ، هەموو ئەمانە بەلێکدانەوەی عەقلە و ئیشی عەقلن.

**دووەم شوێن کە بمانەوێ باشی بکەین (قلب – دڵە)** دڵ پێك هاتیە لەدوو بەش . یەکەمیان ئەو پارچە گۆشتەیە کەلەلای چەپمانە، ئێمە باسی ئەم پارچە گۆشتە ناکەین، چونکە ئەو پارچە گۆشتە خوای گەورە دایناوە لەلای سینەی چەپمان، لەدەقەیەك حەفتاو دووجار لێدەدات ڕۆژێ چەندەها لیتر خوێن بۆ هەموو ئەندامەکانمان بەرز دەکاتەوە و ئەو خوێنەی لەناو دڵمان دایە، دەیگەیەنێتە سیەکان لەسیەکان خاوێنی دەکاتەوە پاشان دەرواتەوە دڵ بەهۆی شادەمارەکان دەچێتە هەموو ئەندامەکانی لەش، ئینجا خوێنی پیس دەگەڕێتەوە دڵ لەوێش بەهۆی دەمارەکان دەچێتەوە سیەکان کە خوێنێکی ڕەشە بەهۆی کرداری هەناسەدان خاوێن دەبێتەوە، ئیتر ئەو کردارە دەکات، ئێمە باسی ئەو پارچە گۆشتە ناکەین، بەلکو باسی ئیشی ئەم پارچە گۆشتە دەکەین باسی سڕی ناو ئەو پارچە گۆشتە دەکەین، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ : ( ان في الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله الا وهي القلب) واتە: بزانن لەناو لاشەی ئێوەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەم پارچە گۆشتە ئەگەر باش بوو باقی ئەندامەکان باش دەبن ئەگەر خراپ بوو باقی ئەندامەکانیش خراپ دەبن، جا ئێمە بابزانین ئەم دڵە هەموو شتە لەئینسان، چونکە لەڕاستی دڵ جێگای ناسینی (رب العالمين)ە لە فەرمودەیەکی قودسی خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ما وسعني الارض ولا السموات ولكن وسعني قلب عبدي

المـــؤمن﴾ واتـه: نەلـەزەوی و نەلـەئاسمان جێگـای منـی تێـدا نـەبۆوە بـەڵام ناسـینی مـن شـوێنەکەی نـاو دڵـی ئیمانداریێکـە، جـا بەڕاسـتی دڵ ئەسـراری ئینسانە جێی خۆشەویستی و رق لێبونەوەیە جێی ترسان و جێی ئەمینیـە، جێی خۆشی و جێی ترشی یە، جێ عاجز بوون جێـی خەفـەت باریـە، جێـی ئیطمیئنـان و سـەکینەتە، بـەڵام جێـی خەوفـە سـبحان الله ئـەم دڵـە جێـی تەکەبورو فیزە جێی تەوازع و ملکەجیە، هەرچی لـەو شـتانەکە دەینووسـم هـەمووی لـەناو دڵـە لـەناو دلی ئـەم ئینـسانە جێگـای خـۆی کردیتـەوە ، جـا خوای گەورە لە قورئاندا بۆ خۆی ئیشارەتی بـەم شـتانە دەکات دەفـەرموێت ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ الرعـد/٢٨، واتـە: ئـەو کەسـانەی ئیمانیـان هێنـاوە دڵیـان ئارامـە ئیطمئنانیـان هەیـە بـەو ئیمانـەی لـەناو دلیتیـان ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ ئـەی ئـەو کەسـەی لـەدوای دلێکـی ئیطمئان و ئاسوودەو بەختەوەر دەگەڕێی بەزیکر بەدەستت دەکـەوێ خـوای گـەورە دەفـەرموێتن ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ.....﴾ الزمر٤٥، واتە: تەماشاکە ئەگەر باسی خـودا بکـرێ باسـی هەیبەت و عەزەمەتی و دەسەڵاتی خودای گەورە بکرێ ئـەو دڵانـەی کـە بـێ باوەڕن هەلدێن، حەزناکەن و خۆنەدزنەوە نایانـەوێ ئـەو حـەق و ڕاسـتیانە بزانن، ئێمە ئەبینین چەند کەسێکمان دائەنیشێ و باسی خوا بکـرێ رادەکا، چەند کەسمان گوێی لەقورئان و ئامۆژگـاری دەبـێ هەڵدێ حـەزناکا گوێـشی بداتێ ئەی ئەم ئایەتە نایگرێتەوە یاخود خـودای گـەورە دەفـەرموێت ﴿....

فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةً وَرَحۡمَةً ....... ﴿٢٧﴾ الحديـد/٢٧، واتـه:
ئێمه وامان كردوه لهدڵی ئهو كهسانهی كه بهدوای محمد المصطفی ﷺ
كهوتوون رهئفهت و رهحمهتمان داناوه بهزهیی و سۆزو حهنانمان داناوه
لهدڵی ئهوانه، یان خوای گهوره دهفهرموێ ﴿لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةً فِي
قُلُوبِهِمۡ﴾ ال عمـران/١٥٦، خـوای گـهوره وهدهكـاتن لـهدڵیان حهسـرهت و
پهشیمانی ئاخ و ئۆف ههبێ، وههـهروهها خوای گهوره دهفهرموێت ٱلَّذِينَ
إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ .... ﴿٣٥﴾ الحج/٣٥، واته: ئهو كهسانهی كه
باسی خوایان بۆ دهكرێتن یان باسی عهزهمهتی خوایان بۆ دهكرێتن
لهئیماندارهكان ﴿وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ دڵیان به خهبهردێ ئهلهرزێ تووشی
خهوف دێ بهرامبهر رب العالمين وهخوای گهوره دهفهرموویتن ﴿وقـذف في
قلوبهم الرعب فريقاً تقتلون وتأسـرون فريقـاً﴾ دهفهرموویت ، ئێمه لهدڵی
كافرهكاندا ترسمان هاوێشته ناو یان، لێتان ئهترسن ههركه چاویان به
ئیماندارهكان دهكهوێت، جا ئهم دڵه جێگای ئهو ههموو شتانهیه كه باسمان
كرد، جائهم دڵه ئهگهر بێتوو توانیمان سپی بكهین بێگهردی بكهین
بهئامۆژگاری و ئیرشادو زیكر ئهو دڵه دهبێت بهدڵێكی رێك دهبێ بهدڵێكی
سالح وه ئهم دله لهجێی خۆیدا ئهمر بهههموو ئهندامهكان دهكا كه باش
بن ئهمر بهچاو دهكاتن كهوریابه كهئاگات لهخۆبێ ، فهرمان بهزوبانت دهكا
وریابه بهكهیفی خۆت قسهی پێ مهكه، ئهمر بهگوێت ئهكا كه وریابه گوێ
بۆ ههموو شتێك مهگره، ئهمر بهدهستت دهكا كه وریابه غهدری پێ مهكه،
بهلكو دائیمهن بهشتی چاك خهریك به كاسبی پێ بكه، یارمهتی خهلكی پێ
بده، ئهمر به ههموو ئهندامهكانت دهكاتن كه بهرهو باشه برۆن، بهڵام

خوانەخواستە ئەگەر دڵت فاسق بوو، ئەگەر دڵمان بۆگەنی بوو ئەگەر دڵمان بێ سەرو بەربوو ئەمر بە هەموو ئەندامەکان دەکا، کە بەکەیفی خۆتان بکەن چ حەزتان لێیە چ هەواو ئارەزو حەزتان دەکا بەکەیفی خۆتان بکەن، خۆمان بابلێین چەند جار کاتێك خەوفی خوامان لەدڵ زیاد بووە کەترسی خوامان لازیاد بووە بزانە چەند فەرقمان کردووە، چەند خۆمان پاراستووە لەنەزەر، چەند خۆمان پاراستوە لەغەیبەت لەقسەی ناشرین و لەشوێنی خراپ، چەند تام و لەزەتمان لەعیبادەت کردوە، چەند وردو لەسەرە خۆو هێمن بوون بەلأم کاتێك بێ ئاگابووین لەخوا دوورکەوتینەوە لەقورئان و محمد المصطفی ﷺ دوورکە وتینەوە بزانە ئەندامەکان چۆن بەرەلا بوونە چۆن لە دەستمان دەرچوونە، بەکەیفی خۆمان قسەمان کردیە گوێمان نەدایتێ، بەکەیفی خۆمان نەزەر دەکەین، بەکەیفی خۆمان شتی نارێك دەکەین، دەی کەواتە گەر دڵ ئاگادار بوو.. ئەگەر دڵ وریا بوو، هەموو ئەندامەکان وریان و ئاگادارن، جا خۆشەویستمانم، ئەم دڵەش دوو بەشە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ (تعرض الفتن على القلوب عوداً عوداً) دەفەرموێ فیتنەو موسیبەت و بەلا لەبۆ ئەو دڵەی دێ وەکو داوەکانی حەسیر، داوی حەسیر کە دروستی دەکەن خاسەتەن ئەوانەی کە قەدیمن دەبینین، کەپەلکەکانی یەك یەك لەسەریەکی تر دانراوە هەندێکی لەسەر هەندێکی تر دانراوە دەفەرموێ ئەو فیتنانە ئاوا بۆ دڵەکەی دێن کاولی دەکەن، دەیفەوتێنن و دەی مرێنن جا دەفەرموێ (عوداً عوداً) یەك لەدوای یەك یەعنی فتنە دائیمەن بۆ ئەو دڵە دێن نەفس و ئارەزوو شەیتان و هەوا هەمووی هەوڵدەداتن ئەو دڵەی تۆ بێ دین بکاتن، جا دەفەرمووێ هەر دڵێك ئەو فیتنەیەی وەرگرت یەکسەر ئەو دڵە ڕەش ئەبێ، خاڵ خاڵی رەشی لێ پەیدا ئەبێ، بەلام هەر دڵێك ئەم فیتنانەی وەرنەگرت پەنجەرەو کونەکانی خۆی داخست ئەو فیتنانە یەکسەر دێن خۆی لێدەدەن و ئەگەرێنەوە هیچیان پێ ناکرێ، لەجیێ ئەوەی کە فیتنەکە خۆی لێداوە

خوای گەورە نورێك و خاڵێكی سپی دائەنێ، دەبێ بەدڵێكی سپی و بێگەرد ساحێبەكەشی خاوێن دەبێ زمانی و داوێنی و دەستی و چاوی و دڵی هەموو ئەندامەكانی ئەو ئینسانە خاوێن دەبێ، بەڵام خاوەنی دڵە پیسەكە نەخێر، یەك لەپێناسەكانی دڵی نەخۆش ئەوەیە ﴿لاینكر منكـــراً﴾ عبدالله كوڕی مسعود دەفەرموێ دەزانن نیشانەی دڵی مردووچیە، فەرموویان چیە فەرمووی (لاینكر منكراً) نازانێ منكر چیە نازانێ معروف، چیە پێچەوانەی دەكاتەوە منكری لێ دەبێتەوە معروف ئەوەی معروفە لێ ئەبێتە منكر، ئەوەی چاكەیە لێی دەبێتە خراپە ئەوەی خراپەیە لێی ئەبێتە چاكە، بۆیە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ وإذا قيل لهم لاتفسدوا في الارض قالوا انما نحـــن مصلحون﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ الاانهـــم هـــم المفـــسدون ولكـــن لايشعرون﴾ بە كەسانێك بڵێ كاكە تۆ پیاوێكی ناوداری خزمەتی میللەت دەكەی، وەرە ئەوە چۆن خزمەت ئاوا دەكرێ، چۆن ئەتوانی ئەو میللەتە چاكسازی بكەی، ئەوەی تۆ هێناوتە هەمووی فاسیدە، هەمووی بۆ گەنیە ﴿قالوا انما نحـــن مـــصلحون﴾ كورە بابە ئێمە هاتووین چاكسازی بكەین هاتوینە خەڵك چاك بكەین، خەڵك رزگار بكەین، دەستی خەڵك ئەگەین، مافی مرۆڤ ئەدەین وا ئەكەین بەڵام هیچی وەنیە ﴿ الا انهم هم المفسدون﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ئەمانە فاسیدەكانن بۆ خۆیان دڵیان مردووەو چۆن بۆ خەڵك و میللەتیان شتی خاوێن و چاك دێنن، جا خۆشەویستەكانم دڵە سپیەكان زۆر جۆریان هەیە دڵی مطمئن دڵی سەلیم دڵی موخلص هەیە، جا انشاء الله ئەمانە هەمووی یەك لەدوای یەكیان باس دەكەین و سیفەتیشیان باس دەكەین، تاكو كەسێكی وەكو من گوێی لێبی یەكسەر بچم ئەوئیشە بكەم، وە دڵە ڕەشەكان مەجموعە دڵێكی مردوون وەسیفاتیشیان چیە، بۆ چی بوون بەدڵی مردوو تاكو ئەگەر خوانەخواستە یەك لەوشتانەمان تێدا بێ یەكسەر دەركی پێ بكەم و فرێی بدەم ئەمانە دڵ بوون وەدڵیش موكەلەفە لەلای رب العالمين كەئیمانی بچێتە ناوی چونكە

ئیمان جێی ناو دڵە، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ قالت الاعراب امنا قل لم تؤمنوا ولكن قولوا اسلمنا ولما يدخل الايمان في قلوبكم﴾ ئەوانەی دەشتێ و بیابان هاتن فەرمویان یا محمد ئێمە ئیمانمان هێناوە خوای گەورە وەڵامی دانەوە فەرمووی ﴿ قل لم تؤمنوا﴾ پێیان بڵێ ئەی محمد ﷺ ئێوە ئیمانتان نیە ﴿ولكن قولوا اسلمنا﴾ ئێوە تەسلیمی حوكمی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بووینە ئەی كەی ئیمان دارن ﴿ولما يدخل الايمان في قلوبكم﴾ واتە: كاتێك ئیمان دەچێتە ناو دڵ ئەوكات ئینسان پێی دەڵێن ئیماندار، ﴿ ما وقر في القلب وصدقه العمل﴾ تەماشاكە ئیمان ئەوەیە (ماوقر في القلب) كە لەناو دڵت جێگیر بێ، بە زمانیش بڵێی ئیعتراف بكەی بە عەمەلیش جێ بەجێ بكەی، تۆ مرۆڤێكی ئیمانداری ئەوەش پێناسەی ئیمانە لەلای ئەهلی سونەو جەماعەت، جا خۆشەویستانم هەتا خوای گەورە لە ئایەتێكدا وەڵامی ئەو كەسانە ئەداتەوە كەخۆیان بەئیماندار داناوە ئیمانیشیان لەناو دڵدا نەبووە خوای گەورە لەسورەتی مائدە لە ئایەتی (٤)دا دەفەرموێ ﴿يا ايها الرسول لايحزنك الذين يسارعون في الكفر من الذين قالوا آمنا بأفواههم ولم تؤمن قلوبهم﴾ تەماشاكە چ دەفەرموێ ﴿ يا ايها الرسول ﴾ ئەی محمد المصطفى ﷺ ﴿ لايحزنك الذين يسارعون في الكفر﴾ عاجزت نەكەن ئەو كەسانەی كە موسابەقە دەكەن لەكافر بوون و لەوەی كە دژایەتی تۆ ئەكەن ﴿ من الذين قالوا آمنا بأفواههم﴾ ئەڵێن بەزوبان یا محمد ئێمە ئیمانمان بەتۆ هەیە (ولم تؤمن قلوبهم) بەڵام درۆ دەكەن، ئیمانیان لەناو دڵ نەچەقیوەو لەناو دڵیان نەبووەو بەزوبانیان بووە، كەواتە دل جێگای ئیمانە، ئەبێ ئەم ئیمانە ئەو بڕواو عەقیدەیە ئەو ئیمان بەخواو بەرۆژی دوایی و بەمەلائیكەت و بەقەزاو قەدەرو بەپێغەمبەران لەناو دڵمان بچەقێنن، ئەو كاتە ئینسان دەبێ بەئیماندارێكی چاك و دروست ورێك و پێك، جا ئەم دڵە موكەلەفە لەلای خودای گەورە كە تەسلیمی

هەموو ئەو ئـەوامیری خـودای رب العـالمین بـێ، چەند مەشاعر و ئەحساس لەناو دڵ هەیە دەبێ هەموویان تەسلیمی رب العالمین بێت انشاء الله بۆ تەواو کردنـــی ئـــەو باســـە، لەدەرســـی داهـــاتوو تـــاکو دیـــدار بـــەخوای گـــەورەتان دەسپێرم..

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

**خۆشەویستانم ئازیزانم، پێ خۆشحاڵم لە دەرسی سێیەم لە زنجیرە باسی گەشتێك بەناو ناخی مرۆڤەكاندا بەخزمەتتان ئەگەمەوە، بە ئومێدی ئەوەی هەموو لایەكمان بتوانین زەبتی خۆمان بكەین، زەبتی عەقل و هەوای نەفسی خۆمان بكەین بۆ ئەوەی بتوانین بەدڵێكی پاك و بەعەقڵێكی سەلیم و بەنەفسێكی مطمئن بەخزمەت رب العالمین بگەین و دەستی یەكتر بگرین  بۆ ئەوەی یەكتر شارەزا بكەین بۆ شەقامی راستی پاكی ئیسلامەتی، بۆیە هەم لەدونیا بەسەعادەت و كامەرانی و خۆشی بژین، هەم لەدوا رۆژیشدا انشاء الله بەبەهەشتی بەرین شادومان بین..**

**ئازیزانم لەدەرسی یەكەم باسی ئەحوالی ئوممەتم كرد، لە هەموو بابەتەكاندا باسی تێك چوونی شیرازەی ئوممەتم كرد، بەڵام یەك خاڵ مابوو، زۆرم حەز دەكرد ئیشارەتی بۆ بكەم، ئەو وەختی بەفكرم دانەهات، ئەویش ئەوە بوو مەسئەلەی قەرزو قەرز داریە كە بەڕاستی گلەییەكی زۆر دەكرێ سبحان الله، دەبینین خەلكانێك ئەو قەرزەی كە لێكتری وەردەگرن وا دەزانی غەنیمەتە لەشەڕدا بەدەستی كەوتووە زۆر بەحەلالی دەیخوات، هەر ئەسلەن ئەو وەختەی قەرزەكەی وەردەگرێ نیەتی ئەوەیە نەیداتەوە، كەی میللەتێكی وا بووین كە تەماعی وا لە ماڵی یەكتر بكەین، قەرزی یەكتر نەدەینەوە، توخوا كەسێك پیاوەتی و چاكەت لەگەڵ بكات، كەسێك یارمەتیت بدا كەسێك دەستت بگرێ و كەسێك لەمەئزەق رزگارت بكات، ئینجا تۆش بەرامبەری ناپیاو بیت، بەرامبەری نارێك بی، نیەتیشت وابێ**

کەپارەی نەدەیتەوە بیخۆی، جابەڕاستی ئەمە دەردێکی زۆر کوشندەیە ئەو بازارەو ئەو هەموو خەڵکە واوەیلایتی لەدەستی قەرزو قەرزدارەکان.
هەرچی عەرەبانەیەك لەکۆڵانەکان دەیگەیتێ، هەرچی قوماش فرۆشە هەربابەتێکە بڕۆ دەفتەری تەماشاکە، هەرچی پارەو سامانی هەیە هەر هەمووی بۆتە قەردو کەس بەلاشی داناچێ کاکە، بۆ پارەکەی نادەیتەوە، وە (الله) مامۆستا راوەستە بەشکەم دۆلار دێتە خوارێ ئەوە دۆلارهاتە خوارێ، دەی بۆ نایدەیتەوە، دەبا هەندێکیکەش بێتە خوارێ، جا قوربەسەر کە دۆلار بلند دەبێ ئەوە قەرزەکە هەر بەجارێك بزر دەبێ، جا ئازیزانم بەڕاستی ئێمە دەردو نەخۆشی و قوڕ بەسەریمان گەلێك زۆرە، ئەگەر ئێمە بەس بەدەردو نارێکی و ئەو شتە خراپانەی کەبەسەر ئێمە هاتووە لە ناو ئێمە تەشەنەی کردوە پێیدا بڕۆین، بڕوا بکە دەبێ پازدە ئەلقە بەس خەریکی دەردو موسیبەتی ئەو ئۆمەتە بین، بەڵام زۆر زۆر لەسەر دڵم گران بوو، چونکە هەر کەسێ دەی گەیشتمێ پێی دەگوتم خۆزیا باسی قەرزداریت بکردایە، خۆزگە باسی ئەو خەڵکەت بکردایە کە چۆن بێ بەزەیی بووە بێ ڕەحم بووە بێ ویژدان بووە دەربارەی ئەوەی کە هیچ پیاوەتی لەپێش چاوی نەمایە، ئەسلەن کەس قەرزی ناداتەوە.
کابرای قەرزدار بڕۆ کاکە سەلامێك لەو کەسە بکە کە قەرزت لێ وەرگرتیە، یەعنی سبحانە الله کابرای کە قەرزی دایە خۆ ئەگەر بەس کابرای قەرزدار هەر بەلای دابێ سەلامی لێ بکا، یاخود مەسەلەن جارجار بچێتە لای بڵێ خاڵە گیان انشاء الله  پارەکەی تۆ دەدەمەوە بەڵام ئێستا نیمە ئیمکانیەتم نیە بڕوا بکە ئەمدایتەوە بەڵام هەر ئەسلەن نەسەلامی لێ دەکا، نە دەچێتە لای نەهاموشۆی دەکاو خۆشی لێ دەشارێتەوە ئێ، بۆ باوکەکەم ئەوە پیاوەتی لەگەڵ نەکردی، جارێکی لەمەحکەمەی هەولێرێ پیاوێکی پیرهات وەرەقەی

ئیستنساخ کرد (کۆمپیالەیەك) بوو زۆر پیربوو، ئەو پیرە ئی ئەوەی نەبوو، بێ کۆمپیالە ئیستنساخ بکا، کابرایەکیش لەوێ ڕاوەستابوو گوتی خاڵەگیان ئەوە تۆ چی دەکەی، لێرە عومری تۆو ئەو پیریە مەحکەمەیان نەگوتیە گوتی رۆڵەگیان ئەوە زەمان و زروفە ئەمنی توشی مەحکەمەی کردیە ئەگەر نا ئەمن بەو عومەرە چ ئیشم بەمەحکەمە و پەیوەندیم بەحاکم و بینەو بەردەی مەحکەمە چیە، گوتی خاڵەگیان توخوا بۆ هاتیە ئێرە، گوتی چیت پێ بڵێم، ئەو خەڵکەی هەتا پارەت لێ وەردەگری دەستت ماچ دەکا بەڵام هەتا لێی وەردەگریەوە دەبێ پێی ماچ بکەی بەس هەتا دەت داتەوە، توخوا ئەوە پیاوەتیە ئەمە ویژدانە ئەمە ئایینە هەیتمان بەو کارەی چاومان لە مالی یەکتری بێ بیخۆین، جا لە دەرسی یەکەم لە هەمو بابەتەکاندا گلەیی زۆرمان لەخەڵکی کرد جائەوەی باسمان نەکردیە ئەدەب و رێزێکمان بۆ دانایە، حەزمان نەکردیە بریندارایان بکەین، لەدەرسی دووەمیش لەئەلقەی دووەم باسی ئەوەمان کرد کە ئەو دەردو موسیبەت و غەم و پەژارە و گۆڕانکاریە و خراپەی کە بەناومان داهاتووە، خودی خۆمانین، خەتای خۆمانە، بەخۆمان وەمان لەخۆمان کردیە ئەوا وەزعمان تێك بچێ و رەحم و بەزەیی و ئایین لەناومان نەمینێ، جا هەستاین ئەو ئینسانەم عەمەلیات کردو گوتمان لەخودی ئەو ئینسانەدا چەند شتێك هەیە، ئەو ئینسانە پێك هاتووە لەجسم پاشان لەروح ئەو ئینسانە پێك هاتووە لە عەقل و لەنەفس و لەقەلب و لەهەوا لەروح ئەوەمان باس کرد گوتمان روحەکە و جسمەکە عیلاقەی بەهیچ نیە چونکە جسمەکە ئالەتێکە ئیشت بۆ ئەنجام دەدا، روحەکەش هێزو ووزەیەك و قوەتێك و کەهرەبایەك کە ئەو حەرەکەو نەشاتەت دەداتێ بەلام ئەوەی لەژووری تەحەکوم بەئینسانەکە دەکات، ئەو چوارەی کە گوتمان عەقلیەتی، یان قەلبیەتی یان

نەفسیتی یان هەوایەتی، هاتین باسی عەقلمان کرد گوتمان چەند شێوە بیرکردنەوە هەیە، دوایی انشاء الله بەتەفاصیل دێینە سەری ئەم عەقلە چۆن چاك دەبێ، چونکە ئەم عەقلە مورشیدە دەبێ ئەم عەقلە تێر بکرێ بەمەعلومات دەبێ، ئەم عەقلە حەقائیق و راستی لەناو بچەسپێ، بۆ ئەوەی بگاتە یەقین، تاکو هەر ئیشێك بکا ئەو ئینسانە پرس بەعەقل بکا عەقلیش ئیرشادی بکاو بەرەو رێی ڕاستی ببا، ئەما ئەگەر ئەم عەقلە مەعلوماتێکی یەقینی لانەبێت، بیرو بۆچوونێکی تەواو و مەزبوتی لانەبێت بەرامبەر بەخۆی و خواو کەون و ژیان، بەراستی رێی باش و ڕێی سەلامەت بەو ئینسانە پیشان نادات.

جا هاتینە سەر دڵ، وە هەندێکمان لێ باس کرد، یەك خاڵ مابوو باسی بکەم ئەویش ئەوەیە، ئەگەر دڵێك تەسلیمی خودای گەورە بێ، ئەبێ بەهەموو مەشاعیرو ئیحساسێکەوە ئەم دڵە تەسلیمی خودای رب العالمین بێت، ئەگەر ئەم دڵە تەسلیم بوو هەموو ئیشەکانی بۆ خوا ئەبێ، نان خواردنی بۆ خوا ئەبێ ، هاموشۆی هەستان و دانیشتنی بۆ خوا ئەبێ، گفتوگۆی هەموو حەرەکات و سەکەناتێکی ئەو مرۆڤە موسلمانە بۆ خوا ئەبێ بۆ؟ چونکە ئەم دڵە بۆ خوابووە هەست و خوستەکانی ژوورێ ناو ئەو دڵەی هەمووی تەسلیمی (رب العالمین)ە رازی بووە، بەفەرمانی خودای گەورە رازی بووە، بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەو ئیشانە ئەبێ بەئینسانێکی رەبانی ئەبێ بەئینسانێکی خودایی، هەموو ئیشەکانی بۆ خوایە هەر ئیشێك بکا هەر ئیشێك ئەنجام بدات، هەر کارێك بکا هەر خێرێك هەر سەدەقەیەك هەر پیاوەتیەك هەر نوێژێك هەر تاعەتێك هەموو ئیشی هەتا مەرحەباکردنی خەڵکی، دانیشتنی لەگەڵ خەڵکی هاموو شۆی خەڵکی هەر بۆ خوایە جا ئەو ئینسانە دەبێتە ئیماندارێکی حەقیقی کاتێك گەیشتە ئەو دەرەجەیە،

شتێكی بۆ پەیدا دەبێ پێی دەڵێن وەلائو بەراء ، ئەو وەلائو بەرائە لەسەر ئەساسی عەقیدەیەكی خودایىیە، بۆ نموونە ئەو ئینسانە ئەگەر كەسێكی خۆش ویست دەبێ لەبۆ خودا خۆشی بووێ، ئەگەر ركیشی لەكەسێك بێتەوە دەبێ لەبەر خوا رقی لێ بێتەوە، وەلائو بەرائێكی وای بۆ دروست دەبێ ئەگەر مەیلی كەسێكی هەبوو یان پشتیوانی كەسێكی كرد یان پاڵپشتی كەسێكی كرد لەبۆ خوا ئەی كاتن، بەڵام ئەگەر دوژمنایەتی كەسێكی كرد، پشتی لەكەسێكی تركرد عەداوەتی كەسێكی كرد، ئەوەش هەر بۆ خوا ئەیكاتن، چونكە دوورە لەخوا، بەڵام هی یەكەمیان نزیكە لەخوا بەندەی خوایە موسلمانە ئەویش دوژمنی خودایە دۆستی شەیتانە و دۆستی خراپە و خراپەكارانە، جابەڕاستی ئەوە زۆر شەرتە كە ئەو دڵە تەسلیمی خودای گەورە بێت، انشاء الله لەدەرسەكانی داهاتوو زۆر بەدرێژی دێینە سەر دڵ، چونكە گوتم دڵ هەمو شتێكە لەژیانی ئینسان بەڕاستی ئەم دڵە پێی ئەڵێن دڵێكی مطمئن، انشاء الله باسی دڵی مطمئن دەكەین سیفاتی چیە، چەند جۆرە دڵ هەنە گوتمان دوو جۆرە سپی و ڕەش، سپیەكان چەند جۆرن سیفاتیان چیە هەر هەمووی انشاء الله بەپشتیوانی رب العالمین باس دەكەین.

خاڵی سێیەم كەدەمەوێ باس بكەم كە نەفسە بزانین نەفس چیە خودای گەورە بۆ هەموو ئینسانێك نەفسێكی دروست كردوە لەزمانی عەرەبی نەفس بەئینسانەكە دەوترێ بەخودی مرۆڤەكەوە نەفس بەئیشی ژوورێ دەگوترێ، سبحان الله مەسائلی عەقل و قەلب و نەفس تارادەیەك تێكەڵاون و لەناویەكن، جار بەجار هەموو دەبنەیەك، جاربەجار لەیەكیش جودا دەبنەوە، ئەمانە هەموو حاڵەتی روحن هەرجارەو بەحاڵەتێك بەدیار ئەكەوێت ئێمە ئێستا یەك لەیەكیان جودا دەكەینەوە، تاكو بزانین

هەریەکێك ئیشی خۆی هەیە جا ئەو نەفسە مەیلی وایە، ئەگەر زەبتی نەکەی بەشەرع، زەبتی نەکەی بەئەوامری خوای گەورە، بەئەوامری پێغەمبەر ﷺ ئەو نەفسە مەیلی شەڕی هەیە، مەیلی تەمبەڵی هەیە، مەیلی زوڵی هەیە ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ إِنَّ رَبِّي غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ یوسف/٥٣ تەماشا حەزرەتی یوسف بۆ خۆی ئەفەرمووێ لە چیرۆکی حەزرەتی یوسف خودای گەورە دەفەرموێ ﴿وَمَا أُبَرِّئُ نَفْسِي﴾ لەسەر زمانی حەزرەتی یوسف ئەفەرموێ، ئەمن پاکانە بۆ نەفسی خۆم ناکەم ﴿إِنَّ النَّفْسَ لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ لەبەر ئەوەی نەفسی ئینسان ﴿لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ ئەمر بەئینسانەکە دەکات خراپە بکات دائیمەن مەیلی خراپی هەیە ﴿إِلاَّ مَا رَحِمَ رَبِّيَ﴾ ئیلا نەفسێك کەخوای جل جلالە، بۆ خۆی لوتفی لەگەڵ کردبێ، زەبتی کردبێ و وەهەروەها گەیاندبیتیە نەفسی مطمئنە، چونکە نەفسیش بەمەراحیلی خۆی تێدەپەڕێ نەفسی ﴿لأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ﴾ە پاشان دەبێتە نەفسی اللوامە، بەزەبت کردنی بە تەزکیە کردنی بەدەرس پێ دانی بە تەربیەت دانی دەبێت بەنەفسی مطمئنە، کە گەیشتە نەفسی مطمئنە بەڕاستی ئەو ئینسانە لەلوتکە بەختەوەری و خۆشی دەژیتن کە ئەو نەفسە تەواو تەسلیمی ئەمرو ئیرادەی خودای گەورە بێت، لەگەڵ دڵ و عەقل ئاوا هەرسێکیان ئەو ئینسانە بەرەو خواو بەرەو بەهەشتی بەرینی دەبەن،ئەو نەفسەش کە مەیلی خراپە دەکات، ئیبتلایەکی رب العالمینە خوای گەورە ئیبتلامان دەکات بۆ ئەوەی بزانی تاچەند ئێمە ملتەزمین بەئەوامری تاچەند دەتوانین ئەو نەفسەی خۆمان زەبت بکەین و جلەوی بگرین، نەیەلین ئەو نەفسە بمان هاژوا بەکەیفی خۆی جلەومان بگرێ و بەرەو خراپەمان ببا، تاچ رادەیەك موجاهدەی نەفسی خۆمان دەکەین تاچ رادەیەك دەتوانین زەبتی خۆمان بکەین، لێرە ئیمانمان بەدیار دەکەوێ

عەقلی تەواو رێك و پێكمان بەدیار دەكەوێ، ئێمە تا چ رادەیەك دەتوانین خۆمـان بگـرین، لەبەرامبـەری ئـەو نەفـسەی كەلـەبۆمان دێـتن، جـا خۆشەویـستانم ئـەو نەفـسەش سیفەتی وایـە زۆر جاهیلـە، زۆر زالمیـشە زۆر رەزیلە سبحان الله ئەو نەفسە سیفاتی خراپـی زۆرە بـەڵام سـێ سیفاتی زۆر زۆر بنەرەتی هەیە:

١) زۆر زاڵمە هیچ روحمی نیە بەزەیی نیە تەجاوزی حدودی خۆی دەكات .

٢) ئەو نەفسە جاهیلە كۆرە كەرە گێلە ئەو ئینسانە زۆر پێوە ماندوو دەبێ، هەتا مەیلی ئەوە دەكات هیچ شتێك سەرف نەكاتن..

٣) سبحان الله زۆر تەمبەڵە حەز لە تەكالیفی خوای رب العالمین ناكاتن هەر حەزدەكا تەمبەل بێ، هەر دانیشی ئەو نوێژەی بەپێنج دەقە تەواو دەبێ حەز ناكات بیكات یاخود تاخیری دەكا، ئەگەر تۆ زۆر زەختی لەسەر بكەی دەڵێ راوەستە عەسر بانگی نەدایە چ پەلەتە، یاخود بەیانیان كە دەنووی وا گوێی لێیە كەبانگ دەر دەڵێ (الله اكبر الله اكبر الصلاة خير من النوم) تۆ دەتەوێ بەخەبەر بێی، نەفسەكەت دەڵێ دەراوەستە ماڵت خراپ نەبێ، واتازە مەلابانگیدا، ئەوە پیرەمێردە خەوی لێ ناكەوێ، خۆ تۆ گەنجی خەو خۆشە، كورە فەصلەكەش خۆشە هەندێكیكە پاڵكەوە كاتێك هەڵدەستی رۆژ لەناوەراستی ئاسماندایە لەگەڵ گەرمای رۆژ ئەتۆ بەخەبەر دێی، جا سبحان الله دائیمەن حەزی لەتەمبەلیە، حەزی لەتەكالیفی خوای گەورە نیە، جا ئەو نەفسەش زۆر زەخت لەسەر دڵ دەكات، كە دڵ تەسلیمی بێ، چونكە ئەزانێ دڵ هەموو شتێكە لەجەستەی مرۆڤ و ژیانی ئینساندا، دەڵێ ئەگەر بێت و ئەو دڵەم گرت سەیتەرەم كرد لەسەری، ئەوا تەواوی مرۆڤەكە دەبتە ئامێرو ئامرازی من، ئەمر دەكەم بۆ دڵ، دڵیش ئەمر دەكات بەهەموو لاشە، كەواتە بەكەیفی ئەو نەفسە دەجولێتەوە، جاسبحانە الله زۆر خەتەرە لێرەدا دەبێتە شەرێكی خوێناوی لەبەینی حەق و ناحەق لەنێو نەفس، جا

بۆیە دەبێ ئینسان ئیهتمام بەدڵی خۆی بدا، چونکە ئەگەر دڵەکە بەهێز بوو، نەفسەکەش پێچەوانەی دڵەکە دەبێ، واتە زەعیف دەبێ بەڵام خوانەخواستە دڵەکە زەعیف بوو نەفسەکە بەهێز دەبێ، جادەبێ زۆر وریای خۆمان بین، لەدەرسەکانی داهاتوو بەئیزنی خوای گەورە باس دەکەین، جا ئەو نەفسە حەز دەکا لەو مەملەکەتەی ئینساندا دڵەکەش عاصیمەیتی، ئەو ئەمر بکا بەعاصیمەکە ئەکا، کەوا هەموو ئەوامرەکانی لەناو ئەو مەملەکەتەجێ بەجێ بکرێ تەنفیز بکرێ، هیچ رەدێکیش نەبێ، سبحان الله ئەلێرەدا زۆر پێویستە ئینسان لەو حالەتەدا زۆر وریای دڵی خۆی بێ، جا ئەو نەفسە هیچ کاتێکیش واز لەو ئینسانە ناینی، تەسەور بکە هەتا ئیشی چاکەشی بێ بکەی ئیلا بەشی خۆی دەوێ، بۆ نموونە یەکێك دەیەوێ نوێژ بکا نەفسەکە زۆر محاولە دەکات نوێژەکە تأخیر بکا، بەڵام کابرا گوێی نەدایە، ئیمانەکەی بڕواکەی یەقینەکەی بە (رب العالمین)ەکەی زۆر تر بوو، ترسان لە خودای گەورە زۆر تر بوو هەستاوە دەستی بەنوێژ کرد وەی لەخۆ کرد، بچێتە جەماعەت دەیەوێ پەشیمانی بکاتەوە، کورە مزگەوت بۆ چی؟ وە (الله) مەلایەکە نوێژی لەپشت جائیز نیە، بۆ خۆت لەماڵێ دانیشە نوێژ بکە گەلەك باشترە ئەگەر پێ لەنەفسەکەی نا چوە مزگەوت بەجەماعەت، لەناو جەماعەتەکە پێت دەڵێ دەزانی تۆ لەو جەماعەتەی لەهەموویان بەدین تری بڕوا بکە هەر وەلی خودای، سبحان الله وەت لێ دەکات تووشی ریا بی وەت لێ دەکا ئەو نوێژەت بەشێك لەبۆ خۆی بێ، زۆر وریای خۆت بە لەو زەمانەدا ئاخ و داخ و موسیبەتی ئێمە لەگەڵ نەفسی خۆمانە ئەو پیاو سالحانە رەحمەتی خوایان لێ بێت دادو بێدادیان بوو لەدەست نەفسەکەی خۆیان، هەتا سەعیدی نەورەسی هەزاران رەحمەتی خوای گەورەی لەگۆڕی بێ، لەیەك لە کتێبەکانی دەفەرموێ کاتێك عیلاجی نەفسی خۆم دەکرد، کاتێك شەڕم لەگەڵ نەفسی خۆم دەکرد کاتێك نەفسی

خۆم زەبت دەکرد توشی نەفسێکی زۆر جا هیل بووم، نەفسێکی کوێری کەری گێلی بێ عەقل هیچ شتێك تەئسیری لێ ناکا هەتا ابن رۆمی یەك لەدکتۆری دڵەکانە زۆر گەورەو مشهورە، یەك لە ئەولیایەکانە ئەویش باسی ئەو نەفسە دەکا کەوا هەیتمان، نەفسێکی تری لەپشتەوەیە، هەر ئەو نەفس موسیبەت و بەلاترە، بەلاّم کەسێك رب العالمین پشتیوانی بێ، کەسێك مەدەدو یارمەتی لەقوەت و عەزەمەتی رب العالمین وەربگرێ ناترسێ، بەلکو خوای گەورە یارمەتی بدا جلەوی نەفس دەکەی هەروەها خۆت زەبت دەکەی ئەو قسە لەهەموو کارێك وازت لێ نایینی، بۆ نموونە دەتەوێ خێر بکەی، فەقیرێك دەبینی دەست کورتە دەتەوێ هەزارو پێنج سەد دیناری بدەیێ، دەڵێ کورە زۆرە رۆژێ سەد دەرکان دەکاتن پێنج سەدی بدێ بەسە، سبحان الله هەزار دینار لەخێرەکەت کەم کردەوە جابەڕاستی ئەم دینە، وەرزشە یەعنی ئەو نەفسە لێ رابینی وەی لێ بکە جارێك دووسێ پێچ شەش ئاخیری ڕاست تەسمیلت دەبێ بەلاّم تۆ ئیستجابەت کرد تەواو، ئەتۆ تەسمیلی بووی ئەتۆ ئیتاعەی ئەو نەفسەت کرد شێخ عبدالقادری گەیلانی هەزار ڕەحمەتی خوای لێ بێ، یەك لە ئەولیایەکانە لەپیاو صالحەکانە و یەك لەعولەماکانە، دەفەرموێ عەبدی ئیمان دار لەبەینی نەفس و لەبەینی خودایە تەماشاکە دەفەرموێ عەبدی ئیمان دار، یاخود هەموو عەبدێك لەبەینی خوداو لەبەینی نەفسەکەیتی ئیتاعەی کامیانی کرد دەبێتە عەبدی ئەو ئەگەر ئیتاعەی خوای کرد دەبێ بەعبدالله، بەلاّم ئەگەر ئیتاعەی نەفسی کرد دەبێتە عەبدی نەفسەکەی، جا انشاء الله موسلمان دەبێت زۆر وریای نەفسی خۆی بێ ئەو نەفسە وەت لێ دەکا هەموو ئیشێك بکەی بابچینە خزمەت قورئانی پیرۆز خوای گەورە لەچیرۆکی حەزرەتی یوسف باس دەکا کاتێك برایەکانی موئامەرمیان بۆحەزرەتی یوسف دانایەوە هەستان چوون هاوێشتیانە ناو بیرەکە، پاشان خوێنێکیان هێنا بەکراسی

حەزرەتی یوسفیان کردو دەستیان بەگریان و شین و لەخۆیان داو چونە لای باوکیان، گوتیان ئێمە لێی غافل بووین ﴿وَجَآءُوٓ أَبَاهُمْ عِشَآءً يَبْكُونَ ۝١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَٰدِقِينَ ۝١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍ ۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ۝١٨ (یوسف/١٦-١٨)، واتە: نەمان زانی ئێمە گەمەمان دەکرد.

ئەویش بۆ خۆی لەلای ئەشیایەکان دانیشتبوو راست گورگ خواردی ئێمەش ئاگامان لێ نەبوو بابەگیان هەر چەندە ڕاستیش بکەین بەس تۆ پێمان بروناکەی ئەمە دەزانین ئەتۆ یوسفت زۆر خۆش دەوێ، جا بزانە حەزرەتی یەعقوب چ وەلامێکی دانەوە قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ یوسف/١٨، دەفەرموێ دەزانم نەفستان ئەمری بەئێوەکرد ئەو تاوانە ، سبحان الله نەفسیان واقەناعەتیان پێ هینان وا سەیتەرەی کرد لەسەر دڵ و عەقلیان بچن ئەگەر یوسف دوور بکەنەوە، ئەوا بابتان زیاتر ئێوەی خۆش دەوێ.

هەتا لەچیرۆکی هابیل و قابیل، خوای گەورە لەقورئان باس دەکا، تەبعەن قابیل وازی لەهابیلی برای نەهێنا هەتا کوشتی، سەدەقەیان دەکرد سەدەقەی ئەو زەمانیش وانەبوو بدرێتە فەقیرو هەژاران، بەڵکو دایان دەنا هەتا ئاگرێك لەئاسمانەوە دەهات دەی سوتاند، هی کامیان بسوتایە ئەوا خوای گەورە قبولی کردیە، جانی قابیلی نەسوتاند، قابیلیش تووڕە بوو

گوتی بۆ خوای گەورە ئی تۆی قەبوول کرد هی منی قەبوول نەکرد، گووتی ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّـهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ﴾ (المائدة/١٨)، واتە: خوای گەورە لەئینسانی خاوێن و موتەقی قبول دەکا، خۆ بەدەستەمن نیە، خوای گەورە لەبن دەستی ئێمە نیە، ئێمە لەبن دەستی خواین، خوا بەکەیفی خۆیتی، قبولی دەکا کەیفی خۆیتی دواتر وەی لێ هات هەتا کوشتی، جا خوای گەورە دەفەرموێ ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ....﴾ (المائدة/٣٠)، تەماشاکە ئیتاعەی کرد ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ﴾ بۆی کرد تەسمیلی ئەوامری نەفسەکەی و نەفسەکەش ئەمری پێ کرد، کەوا برایەکەی خۆی بکوژێ، ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ بەس ئەوەی خۆی تەسمیلی نەفسەکە کرد، نەفسەکە الامارە بالسوء بوو، ئەوە کابرای بەهیلاك دا و تووشی هیلاکەتی کرد، توشی خەسارەت مەندی کرد جا خۆشەویستانم بەڕاستی ئەو نەفسە زۆری دەوێ، زۆر ماندوو بوونی دەوێ انشاء الله لە دەرسەکانی تر ڕوونی دەکەینەوە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ** فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴾ (الشمس/٧- ٨)، تەماشا خوای گەورە نەفسی دانایە کە هەم خراپە و خراپە کاریشی لەپێش دانایە، وەهەم چاکە و چاکە کاریشی لەپێش دانایە، ئێمە دەبێ چی بکەین دەبێ ئەو نەفسە زەبت بکەین تەسمیلی دڵ و عەقلمان بێ بۆ ئەوەی تووشی خراپەو خراپە کاری نەبین انشاء الله ئەوە بەکورتی نەفسەکە بوو، خاڵی چوارەم باس بکەین، ئەویش زۆر موبتەلاینە پێی کە هەوایە، هەوا عولەمای شەریعەت ئەوانەی باسی تەزکیەی نەفس دەکەن ڕەحمەتی خوایان لێ بێت دەفەرموێ کەلەپێناسەی هەوا (هو ما تميل اليه النفس) دەفەرموێ مەیلی ئەو ئینسانە کە ئیشتهای دەکا و حەزی لێیە و بۆچی دەچێ تەبعەن هەوا ئیشی نەفسە، ئەو نەفسە حەز لەچ بکا بەهەوایەکەی دەکاتن، وەك بلێ هەوا عەمەلەی بن دەستی نەفسە، خزمەت کاری بن دەستی نەفسە ئەو نەفسە چ ئیشتهای بکا

چ حەز بکا چ بیەوێ یەکسەر ئەو هەوایە لەبۆی دەچێ، ابن القیم الجوزی رەحمـەتی خـوای لێ بـێ ئەفـەرموێ لەبـەر ئـەوەی هـەوا عـادەتی وایـە لەسنووری خۆی دائمەن زیادە ڕۆیی دەکا، دەبیـنین ئینـسان مـەیلی خـواردن دەکا، دەچێ دەیخوا تەواو زیادە ڕەوی دەکات لـەخواردن، لەهـەر شـتێك پێـی نیشان بدەی مەیلی بکاتن ئیلا زیادەرەوی دەکا بۆیە لەقورئان و حـەدیـث دا زۆر زەمی کراوە لەبەر ئەوەی ئەو هەوایە ئیلا دەبێ زەبت بکرێ، ئەگـەر نـا ئیلا زیادەرەوی لەسنووری خۆی دەکـاتن و شـتی بـێ شـەرعی و خراپـەکاری زۆر دەکـاتن بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ ( لایـؤمن احـدکم حتـی یکـون هواه تبعا لما جئت به) واتە: کەس لەئێوە ئیمانتان کامل نابێ و تەواو نـابێ، هەتا حەزو ئارەزووی لەگەڵ ئەوە نەبێ کە پێغەمبەری خوا ﷺهێناویـەتی، یـەعنی هـەوای تـۆ و مـەیلی تـۆو پێغەمبـەر چـی دەوێ، خـوای گـەورە چـی دەوێ مـەیلی تـۆش ئـەوەی بـووێ، بـەڵام عەکـسی ویـستی خـوداو ویـستی پێغەمبەر ﷺ بوو کەواتە ئیمانمان کامل نابێ، کـەینێ ئیمانمـان کاملـە کـە هەوایـەکانمان ئیـشی نەفـسەکانمان کەمـەیلمان هـەمووی بەویـستوو ئـیرادەی رب العالمین بێ خوای گەورە چی لەئێمە دەوێ، خوا چـی پـێ دەوێ، ئێمـەش ئـەوەمان پـێ دەوێ پێغەمبـەر ﷺ چـی پـێ خۆشـە ئێمـەش ئـەوەمان پـێ خۆشە، خوا چـی پـێ ڕاسـتە ئێمـە ئـەوەمان پـێ ڕاسـتە پێغەمبـەر چـی پـێ راستە، ئێمە ئەوەمان پێ ڕاستە، ئەوان چی بڵێین ئێمە بڵێین سمعنا واطعنـا ﴿سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ (البقـرە/٢٨٥)، جـا کاتێـك هـەوا ئەوهای لێ هات، تەسمیلی خودا و پێغەمبەری خودا بوو بەڕاستی ئـەو کاتـە ئیمـانی ئینـسان کامـل دەبـێ و ڕێـك و پێـك دەبێـت، ئیمـامی شـەعەبی ئەفەرموێ بۆیە هەوا پێی دەڵێن هەوا، چونکە کابرای بەهیلاك ئەبا ئەگـەر بەگوێی بکا و زەبتی نەکاو جلەویش نەگرێ کابرای ئەفەوتێنێ، ئەو هەوایە عادەتی وایە فکری هیچ ناکاتـەوە، یـەعنی مـەیلی ئـەو هەوایـە فکـر لـەهیچ

ناكاتەوە، هەر ئیشێك ئەنجام بدات فكر لەوە ناكاتەوە شەر مەزار، دەبی یان خوای گەورە لێم توڕە دەبی، یان پێغەمبەر ﷺ دڵی لێم دەشكێ، خۆی رۆژی قیامەتێ سزا دەدرێم، سبحان الله هیچ فكر لەعەواقیب و پاشەرۆژی خۆی ناكاتەوە، بۆیە تەماشاكە ئێستا منداڵێك بەئیشتهای خۆی بەمەیلی هەوای خۆی شت دەكا چونكە عەقلی رێك و پێك نەبووە هەتاكو هەوایەكەی دامەزرێنی و جلەوی بگرێ ئەو هەوایەش بەسێ شتان زەبت دەبێ یەك بەمروئەت بەپیاوەتی و شەهامەتی، دوو بەعەقل، سێ بەدین، تەماشاكە بە مروئەت ئینسان فكركاتەوە بلێ پیاوم، چۆن شتێكی ئەو هاكەم دەكەم بۆ نموونە ئارەزوو وەت لێ دەكا نەزەری بكەی، تۆ دەبێ شەرمت بەخۆ بێ، تۆ پیاوی ئەو ئافرەتەی تەماشات كرد، ئەگەر تۆی ناسی چیت پێ دەڵێ لەناو خەڵكی، كاتێك دەتەوێ غەدرێك بكەی یان دەتەوێ پارەی خەڵكی بخۆی، وە كو ئەو خەڵكەی قەردی ناداتەوە تۆ دەبێ بزانی مروئەتت هەیە، پیاوەتی و شەهامەتت هەیە دەبێ شەرم لەخۆ بكەی، ئەو كابرایەی كە قەردی دەخوات ئاخۆ عەیب نیە ئەگەر لەناو خەڵكی باسی كردی مروئەت و شەهامەتەت دێتە خوارێ كەسایەتیت دێتە خوارێ، جاترسان لەنزمی مروئەتی سەبەبێكە، جلەوی هەوایەكەی بگرێ، ئیمامی شافعی هەزار رەحمەتی لەگۆری بێ ئەفەرموێ، ئەگەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد ئەیكاتە لەكەو عار لەسەر مروئەتم، ئاوی ساردم نەدەخواردەوە سبحان الله ئەوانە تەماشا حیسابی چیان كردیە ئەگەر ئاوی سارد خواردنەوەی ببێت بەمایەی ئەوەی مروئەتی كەم كاتەوە شوخت بەمروئەتی دابینی نەی دەخواردەوە، تەماشای خۆمان بكەین جا چمان ماوە مروئەتمان بمینێ، ئەوەی خواو پێغەمبەر پێی ناخۆشە ئەیكەین، كەی ئەمە مروئەتە هەیتمان، پیاو دەبێ ساحێبی قسەی خۆی بێ ئەگەر قسەیەكی كرد هەزار ملیۆن دیناری لێ زەرەر بێ لە قسەی خۆی پەشیمان

نابێتـەوە، چـونكە خـۆی بـەپیاو ئـەزانێ، خـۆی بـەخاوەنی شـەهامەت و مروئـەت ئـەزانێ ئێستا بـۆ دۆلارێـك زیـاتری ئـەدەنێ پەشـیمان ئەبێتـە وە دەبینین كابرا چویتە دوكانی قوماش موعامەلەی كردیە، یەكێك هـات یـەك سـەنتی گـرانتر دایتـێ یەكـسەر كـابرای یەكـەمین ئیهمـال دەكـا وە الله كاكـە فرۆشتم نازانم لەبەرچی قسەكەی خۆی شكاند، ئەمە كەی مروئەتە ئینسان ئەگەر مروئەتی هەبێ بەگوێی هەواو نەفس و ئـارەزووی خـۆی ناكـا، بـەڵكو لەبـەر شـەرمی خـۆی لەبـەر سـومعەی خـۆی لەبـەر كەرامـەتی خـۆی لەبـەر مروئەتی، ئەم شتانە نەكات ئەبێتە مایـەی ئـەوەی مروئـەتی بـرواتن خـاڵی دووەمیش بەعەقل ئەو عەقلە پێی دەڵێ، كاكـە چـی دەكـەی عاقیبـەتی ئـەو ئیشە خراپە ئەتۆ ناترسێی لەخواو لەپێغەمبەری خوا ﷺ لەرۆژی قیامەتی ناترسـی، لـەناو خـەڵكی سـومعەت بـچێ ئـەو فكـر كردنـەوەی عـەقل ئـەو لێكدانەوەی عەقل وە دەكا ئینسان بگەڕێتەوە هەوای خۆی زەبت بكا سێیەم بەئایین ئینسان چەند بەدین بوو چەند رێك وپێك بوو لەخواترسا، چەند نزیك بوو لە خوا هەوایەكەی جلەوی توندتر دەبێ و ناتونێ هـەموو شـتێك بكـا بەكـەیفی خـۆی بداتـە بـەرێ دەسـتی بـەگوناهو بـێ شـەرعی بكـا، جـا خۆشەویستانم ئەو هەوایە لەقورئان و سوونەت دا زۆر زەمی كرایە، ئەوەتـە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿أَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلاً﴾ واتە: دیتت ئەی محمد ﷺ ئـەم خەڵكـە چۆن ئارەزووەكـانی خـۆی كردیتـە خوای خۆی بەگوێی دەكا وە (الله)ی خوای میهرەبان ئێمە هەموو ئەو هاینـە ئێستا هەمووومان هەوامان كردیتە خوای خۆمان، (خوا كێتـە) ئـەو كەسـەیە ئیتاعـەی دەكـەی ئـەو كەسـەیە ئـەوامری تـەنفیز دەكـەی، ئەوانـەی كەلەنەهیـەكان و لـەو شـتانە كـە خراپـە بـەدوور دەكەویـەوە، ئێـستا هەوایەكەی ئێمە مەیلی شەهەوات و نەفسی ئێمە بۆتە خوامان هەمووشمان بەگوێی وان دەكەین (هەواو نەفس) ئەگەر ئەوان پێیان ناخۆش بێ ئێمەش

پێمان ناخۆشه، ئەوان مەیلیان لێ بێ ئێمە مەیلمان لێ یە، ئەوان چیان پێ بێ ئێمەش ئەوها دەکەین بێ گومان ئەمەش زۆر زۆر ترسناکە، ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ... وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾ (الكهف/٢٨)، واتە: یا محمد ﷺ یائومەتی محمد ﷺ بەدوای ئەو کەسانە مەکەون ئەوامری ئەو کەسانە جێ بەجێ مەکەن، گوێڕایەلی ئەو کەسانە مەکەن کەئێمە دلّمان توشی غەفلەت بوونە ﴿مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَن ذِكْرِنَا﴾ ئاگای لەخوانیە ئاگای لەمحمد المصطفی ﷺ نیە ئاگای لەدوا رۆژ نیە ﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطاً﴾ دلی زیکری خودای تێدا نەبێ، نوری خودای تێدا نەبێ، عەشقی خودای تێدا نەبێ، ج ئیش دەکا ئارەزوو ئیش دەکا ﴿وَاتَّبَعَ هَوَاهُ﴾ هەموو شتی زۆر بێ سەرو بەرن جا بەڕاستی ئێمە ئەو هامان لێ هاتیە، ئێمە بەخۆشمان بەدوای هەوا کەوتینە بەدوای هەوای خەلّکیش کەوتینە بەدوای کەسانێکی واکەوتینە ئەسلەن فری بەدین و ئیمانیش چییە نیتیان، جابەڕاستی ئەو هەوایە زۆر جاران وەی لێ دێ زولم لەنەفسی دەکات، یەعنی ئەوەندە کاری خراپ دەکا ئەوەندە لەحەدی خۆی دەچێتە دەرێ نەفسەکەی کەساحێبی هەوایە ئەویش موبتەلایە بەدەستەوی، ئەویش هاواری لێ هەل دەستی انشاء الله لەدەرسی چوارەم باسی ئەوەتان بۆ دەکەم، لەکوێندەری هەوا زولمی لەنەفسی کردیە لەقورئانیش خوای گەورە چۆن باسی ئەوە حەقیقەتە دەکات، تاکو دەرسێکی تر بەخوای گەورەتان دەسپێرم.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على سيدنا محمد و على اله وصحبه أجمعين . السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

خۆشەویستان لەدەرسی پێشوو لەو شوێنە ڕاوەستاین، گوتمان هەوا وەی لێ دێ ئەوەندە لەحەدو حدودی خوێ دەردەچێ، ئەوەندە زیادەڕۆیی دەکات، ئەوەندە بەرەلا دەبێ، هەتاوەی لێ دێ زولم لەنەفسەکەش دەکات، دەبێتە خزمەت کاری نەفس و کرێکاری نەفسە کرێ گرتەی نەفسە، وەی لێ دەکات نەفسەکە لەبن دەستی ئەو هەوایە دادی بێ دادوبێ، یەعنی ئەو هەوایە توشی یەك تەهلوکەو مەترسی و یەك زولی دەکا کەوای لێ دەکات ئەو نەفسە لەبن دەستی ئەو هەوایە بگرییێت و نالەی بێتە دەرێ، بۆیە دەبینین خوای گەورە کاتێك کەباسی حەزرەتی ئادەم دەکات، کەباوکە ئادەم و دایکە حەوا سەلامی خوا لەهەموویان بێت، لەپێغەمبەری ئێمە بەتایبەتی ﷺ کاتێك کە لەناو بەهەشتدا دارەکەیان خواردو ئەمری خوای گەورەیان شکاند، خوای گەورەش سزای دان بەوەی دەری کردن لەبەهەشت، بزانە حەزرەتی ئادەم چی فەرمووە؟ فەرمووی ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ الاعراف/٢٣، واتە: زولمان لەنەفسی خۆمان کرد بۆ ؟ چونکە بەگوێ ی هەوایەکەمان کرد، هەوایەکەو مەیلەکەمان وەی لێ کردین، ئیشتیهایەکی ئەوەندە لەبۆ پەیداکردین، بۆ ئەو دارەی وەمان زانی ئەگەر دارەکە بخۆین دەبینە مەلیك، بۆیە بەگوێمان کرد یەکسەر خواردمان، ئەو هەوایە وەی کرد زولی لەنەفسەکەی کرد، ڕۆژێکیان ئیمامی ئەبو بەکر ڕەزای خوای لێ بێت، داوای لەپێغەمبەر ﷺ کرد کە دوعایەکی فێر بکات بۆ خۆی بخوێنی فەرمووی ئەی ئەبوبەکر تۆ

کاتێك که گەیشتیه تەحیات لە ئاخیری تەحیات ئەو دوعایە بکە ﴿ اللـــهم اني ظلمت نفسي ظلماً كثيراً ولا يغفر الذنوب الا انت فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني انك انت الغفــور الـــرحيم﴾ تەماشا ئەو دوعایە چەنجد خۆشە، خۆشەویستان پێم باشە ئەوەی بزانن کە زانایان دەفەرموون کە صەحابەك لەپێغەمبەری پرسی ﷺ (أيَّ الدعاءِ أسمـــعْ) یا پێغەمبەری خوا کام دوعا گیراوترە و قبولْ دەبی، فەرمووی (دبر كل صلاة مكتوبة) لەپاش هەموو نوێــژێکی فــەرز، هەنــدێك لــەزانایان دەفــەرمون پــاش نوێــژە فەرزەکەیــە، مەقسەدی پــێش ســەلام دانەوەیە یــەعنی لەپاش خوێنــدنی تەحیاتــدا لــەو دوعایانە بکە، دوعای زۆر بکە چونکە جێی قبول بوونی دوعایە هەنــدێك زانا دەفەرموون لەپاش سەلام دانەوەیە جا ئیبن القیم الجوزی رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرمووێ ئـەخێر پـێش سـەلام دانەوەیـە لەبـەر ئـەوەی کـە سـەلامت داوە یـەعنی هەسـتای تـەواو کۆتایـت پـێ هێنـا، دیـسان چـۆن دەگەڕێیــەوە بلێی ئــەوەم دەوێ ئـەوەم نـاوێ پـێش ئـەوەی سـەلام بدەیـەوە، دەمێکە رازو نیاز دەکەی داوای لێ دەکەی ﴿ اهدنا الصراط المـــستقيم ﴾ داوا ئەکــەی بتکاتــە ئــەهلی بەهەشــت، لەگــەڵ قافلــەی ئیمــان داران لەگــەڵ راستگۆیان لەگـەڵ صـدیقان بـژی، کەواتــە تــۆ پــێش ئــەوەی کۆتــایی بــە گفتوگۆیەکەت و پاڕانەوەکەت بێنی داوای لێ بکە، جا لێرە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئیمامی ئەبوبەکری فێر کرد ئەم دوعایە بکات کە دەفـەرمووێ ﴿ اللهم اني ظلمت نفسي ظلماً كثيرا﴾ تەماشاکە ظلماً کثیرا وەم لێ هاتیـە زۆرم زولم لەنەفسی خۆم بکەم بەچی بەسایەی هەوام.

ئـارەزووم بـەرەڵا بـوو، هـەوام لەحـدودی خـۆی چـویتە دەرێ، خـوای گـەورە لەسورەتی آل عمـران باسـی تۆبـە کـاران و ئـەو کەسـانە دەکـا کـە بـوون بـە موتــەقی حــەقیقی، یــەکێك لەســیفاتەکانیان ئەوەیــە کــە دەفــەرموێت

﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (آل عمران/١٣٤) ، ئەو جا دەفەرموێت ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ال عمران ١٣٥، تەماشابکە ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَـٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ ئەوانەی گوناهیان کرد، شتێکی وایان کرد کەخوای گەورە پێی ناخۆشە یان زولمیان لەنەفسی خۆیان کرد، بەچی زولمیان لەنەفسی خۆیان کرد بەو هەوایە کە بەرەلایان کردووە کە حدودیان لەبۆدانەنا، زەبتیان نەکرد بە دین بەعەقل بەمروئەت، ئەو هەوایە وەی لێ کردن زولم لەساحێبەکەی خۆی کرد، حەزرەتی موسا کاتێك کە چوو دوو کەس بەشەر دەهاتن ﴿ هذا من شيعته، وهذا من عدوه﴾ کە یەکێکیان لەبەرەبابی خۆی بوو ئەو یتریان فیرعەونی بوو، لەقیبتیەکان بوو، هەستا چوو لێکیکردنەوە، ئەو کابرا قیبتیە هەر ڕانەوەستا ئەویش مستێکی راوەشاند، سبحان الله هەر بەبۆکسەکی کابرا مرد، جا حەزرەتی موسا ئەم دوعایەی دەکات ﴿رب اني ظلمت نفسي فاغفر لي فغفر له ﴾ دەفەرموێ ئەی خودای میهرەبان من زولم لەنەفسی خۆم کرد نەم زانی، دەبێ عەفوم بکەی، خوای گەورە دەفەرموێ ئێمەش لێت خۆش بووین ئەلێرە حەزرەتی موسا دەفەرمووێ ﴿ رب اني ظلمت نفسى﴾ واتە من زولم لەنەفسی خۆم کرد نەدەبا ئەم بۆکسەم لێدابایە، نەدەبوایە بەگوێی هەواو نەفسی خۆم بکردایە، ئەوە حەقیقەتێکی قورئانیە کەهەوا زەبت نەکرێ، زولم لەساحێبەکەش دەکات، دەمینێتەوە یەك خاڵ پێم خۆشە باسی بکەم، ئایا دەوری شەیتانی چیە لەگەڵ هەوا، ئایا شەیتان چ

دەورێکی هەیە، چونکە ئەوە خودی ئینسانەکە ئەومندەی تێدابوو، عەقل و نەفس و هەوا، ئەدی شەیتان خۆداخلی ئینسان نیە خارجی ئینسانە، دەوری ئەو شەیتانە چیە لەگەڵ هەوا، پێش ئەوەی بچینە سەر ئەو تەکتیك و ئەو موئامەرەی لەبەینی هەواو لەبەینی شەیتان دەکرێ، پێم خۆشە یەك حەقیقەت بزانین، شەیتان یەکێکە لەجنەکان و لەگەڵ مەلائیکەتان ژیاوە لە ئاسمان، پاشان عیبادەتی خوای گەورەی زۆر کردیە، هەتا خوای گەورە ئادەمی دروست کرد ئادەمی دروست کرد فەرمانی بە مەلائیکەتەکان کرد کە هەرکاتێك نەفخی روحم لەئادەمی کرد ﴿فَقَعُواْ لَهُ سَاجِدِينَ﴾ (الحجر/٢٩)، ئێوەش هەموو سوجدەی بۆ ببەن ﴿ فسجد الملئكة كلهم اجمعون ﴾ هەموو مەلائیکەتان سوجدەیان برد ئیلا شەیتان نەبێ ﴿ ابىَ واستكبر وكان من الكافرين﴾ یەعنی رەتی کردەوە گوتی سوجدەی لەبۆ نابەم استکبر خۆی بەگەورەتر زانی ﴿وكان من الكافرين﴾ لەبەر ئەوە ئەم قسەیە دەکەم، زۆر کەس وەدەزانی شەیتان یەك بووە لەملائیکەتە موقەڕەبینەکان، زۆر عیبادەتی خوای گەورەی کردووە و پاشان خوا نەعلەتی لێ کردیە، راستە ئەوە عیبادەتی خوای گەورەی کردیە، بەڵام شەیتان مەلائیکەت نەبوو دەبێ ئێمە بزانین شەیتان مەلائیکەت نیە بەلکو شەیتان جنە، بەسێ دەلیلی قورئانی یەکەمین خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ لا يعصون الله ما امرهم ويفعلون مايؤمرون﴾ خوای گەورە باسی مەلائیکەتەکان دەکات دەفەرموێ ﴿ لايعصون الله ما امرهم ﴾ ئەوانە هەرگیز بێ ئەمری خوای گەورە ناکەن ﴿ ويفعلون ما يؤمرون﴾ خوا چیان پێدەڵێ ئەوەی دەکەن کەواتە ئەو شەیتانە عصیانی خوای گەورەی کرد لەمەلائیکەتان نەبووە دەلیلی دووەم خوا ئەفەرموێ شەیتان دەڵێت خودای میهرەبان ﴿ خلقتني من نار وخلقته من طين﴾ تۆ ئەمنت لەئاگر دروست

کردووه، ئادەمیشت لەخۆڵ دروست کردیە مەعلومی جەنابتانە جن لـەئاگر دروسـت کـراوە، مەلائیکـەتیش لـەنوور دروسـت کـراوە، مـرۆڤیش لـەخۆڵ دروسـت کـراوە، ئـەو بـۆ خـۆی دەڵـێ ﴿ خلقـتني مـن نـار﴾ ئـەمن بـۆ بڵـێم مەلائیکەتە کە خۆی اعتراف نەکات کە ئەصلی ئەو ئاگرە، کەواتەجنە.

دەلیلی سێ یەم : خوای گەورە لەسورتی الکهف دەفەرموێ ﴿ الا ابلـیس کـان من الجن ففسق عن امر ربه﴾ واتە: ئەمرمان کـرد سـوجدە بـەرن بـۆ ئـادەم ئـەو شـەیتانە نـەی بـرد، یـەکێك بـووە لەجنـەکان هەڵگەڕایتـەوە لەئـەمری خوای گـەورە ئیتاعـەی ئـەمری رب العـالمینی نـەکردووە، دەی کەواتـە خـوای گەورە بۆ خۆی بفەرمووێ ﴿ کان من الجن﴾ کەواتـە یـەکێك لەمەلائیکەتـە گـەورەکان نـەبوو، یـەکێك لەجنـەکان بـووە، کاتێـك سـوجدەی لـەبۆ ئـادەمی نەبرد، ئەو سوجدەیە تەحیەیە و اکرام بوو ئەمری خودا بـوو، چـونکە ئـەو سوجدە لە بۆ خودی ئادەم نەبوو بەلکو ئەو سوجدەیە ئەمری خوادبوو.

ئـەمری خـودا وا بـوو کـە سـوجدە بـۆ ئـادەمی بـەرێ، ئـەو ئـەمری خـودای شکاند، نەك بلێ وە (الله) ئەمن سـوجدە لـەبۆ ئـادەمی نابـەم، نـا بـەلکو ئـەو ئـەمری رب العـالمینی شـکاند، ئێـستا خـوای گـەورە بەئێمـە دەفـەرموێ روو لەقیبلە بکەن سوجدە بەرن، ئایا ئێمـە بـۆ قیبلـە سـوجدە دەبـەین؟ نـەخێر بەلکو بۆ خودا سوجدە دەبەین، بـەڵام ئـەمری خودایـە کـە سـوجدە دەبـەی، مەلائیکەتـەکانیش ئـەوا ئـەمریان جێبـەجێ کـرد، بـەڵام ئـەمری خوایـە سوجدە دەبەن نەك بەئەمری ئـادەمی علیـە سلام بڵێ مەلائیکەتینـە وەرن سوجدەم بۆ ببەن نەخێر شتی وانـەبووە بـەلکو ئـەمری خودایـە، جـا ئەمـە خـاڵێکی پێویـست بـوو زۆر کـەس لـەناو دڵـی شـك و گومـانی هەیـە، نـەخێر ئەوە ئەمری خودای گـەورەی شـکاندوە ﴿ کان من الجن ففسق عن امر ربـــه﴾ دەرچوو لەفەرمانی کێ لەئەمری خوا نەیگوت لەئەمری ئادەمی علیە سلام،

کاتێك ئەو شەیتانە ئەو عصیانەی کرد، یەکسەر خودای گەورە لە رەحمەتی خۆی دەری کرد نەعلەتی لێ کرد، ئەویش داوای کرد گوتی خوای گەورە بمهێڵەوە، یەعنی عومرم بازۆر درێژ بێ هەتا ئاخیر بەشەریەت، خوای گەورە فەرمووی ئەتۆ لەو کەسانەی کە عومرت زۆر درێژ دەبێ ئاخیری دەمری، ئینجا شەیتان سوێندی بەعزەت و جەلالی خوای گەورەی خوارد کە من تازە واز لە بەنی ئادەم نایەنم هەلیان دەخەلەتێنم لەرێگایان لادەبەم و رێی خراپیان پیشان دەدەم و رێی ڕاستیان لێ تالّ و تفت و ناخۆش دەکەم، هەتا بچنە جەهەننەم، ئەو جا خوای گەورە فەرمووی جەهەننەم لەتۆ پڕ دەکەمەوەو لەو کەسانەی کە بەدوای تۆش دەکەون، هەموویان بەجەهەننەم موشەرەف دەکەم، جامەبەستی ئێمە، دەوری ئەو شەیتانە چیە لەگەڵ ئەو ئینسانەی، ئەو شەیتانە لەخارجی ئەو ئینسانە دەسورێتەوە، بۆ ئەوەیە ئەو ئینسانە هەل بخەلەتێنی لەخشتەی ببا، لای بدات لە سەر رێی ڕاست، دەبێ عیلاقەی لەگەڵ ژورێ پەیدا بکات یەکەم تەنزیمی داخلیی ئەو شەیتانە عیلاقەی لەگەڵ دەبەستێ بۆ ئەوەی ببێ بەبنکەیەکی تەنزیمی بۆ ئەو ئینسانە چیە؟ هەوایە کەیتی واتە ئارەزووی مرۆڤ یەکەم خانەی تەنزیمی شەیتانەکانە .

ئیتصال بەهەوای دەکات چونکە ئەزانێ مەیلی هەوا لەگەڵ شەیتان یەك مەیلە، بۆیە یەکسەر یەك دەگرن، ئیتفاق دەبەستن شەیتان لەدەرەوە وەس وەسەی بۆ دەکات، ئەویش لەژورێ یەکسەر تەنفیزی دەکا کە ئەو هابکە و نەفسەکەش ئەمر بەدڵ دەکات ئەوها بکە ئینسانەکە بەجارێك بەحەرەکاتی دەستی شەیتانەکان ئەجولێتەوە ئەو ئینسانە ئەو ها تەسلیمی دەبێ.

هەوا ئەمر بەنەفس ئەكات ، نەفیسش ئەمر بەدڵ، وەهای لێ دی ئەو ئینسانە بیەوێ و نەیەوێ حەز بکاو حەز نەکا، وەها سەیتەرەی نەمابێ لەسەر خۆی بەئەمری شەیتان ئەجولێت، شەیتان بەهۆی وەس وەسە، ئیعازی خۆی لەبۆ ئینسانەکە رەوان دەکا، ئەو ئینسانە بەردەوام مەیلی خراپەو مەیلی شەڕو مەیلی ئاژاوەی دەبێت.

جا ئەو شەیتانە نایێ بڵێ ئەی ئینسان وا بکە، نا وانالێ ، شەیتان جنێکی زۆر عاقڵە بلیمەتە، بڕوابکە ئەگەر مودیر دائیرەیەك پەنجا ساڵ لەدائیرەکەی ئیش بکات یان لەشەریکەیەك ئیش بکات هەموو شوێنێکی ئەو دائیرە دەزانێ چیە و چی تێدایە لەهەموو ئیشی ئیدارەی زیرەکترین کەسە، ئەگەر شەیتانێك چەندەها ساڵە خەریکی ئینسانە ئەبێ باش باش بزانین دراسەی عیلمی ئەو ئینسانەی کردبێ، کە ئەو ئینسانەی چۆن هەڵ دەخەڵەتێنن، کەواتە شەیتانەکان زۆر زیرەك و بلیمەتن، جا کاتێك دی ئەمر بەخراپە دەکات نایێ فلان برۆ ئەو گوناهەی بکە، نابەڵکو هەنگاو هەنگاو لە بۆی دێت، بۆیە خودای گەورە ئێمە ئاگادار دەکاتەوە لەقورئان دەفەرموێ ﴿ ولاتتبعوا خطوات الشيطان انه لكم عدو مبين﴾ واتە: ئەی ئەوکەسانەی ئیمانتان هەیە، دیارە کافرەکان خطواتی شەیتانی پێ ناوێ، هەربەخۆیان لەگەڵ شەیتانینە، دەفەرمووێ ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمانتان هەیە، بەدوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون ﴿ ومن يتبع خطوات الشيطان فانه يامر بالفحشاء والمنكر﴾ دەفەرموێ کەسێك بەدوای خطواطی شیتان و خانە خانەکانی شەیتان بکەون، یەکسەر وەی لێ دەکات ئاخیری سەیتەرەی لەسەر پەیدا دەکات و ﴿ يأمر بالفحشاء والمنكر﴾ ئەو کەسە هەرچی فحشاء هەرچی خراپەو مونکەر هەیە، هەرچی خوا پێی ناخۆشەو ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە و شتی نارێکە هەمووی پێ ئەنجام دەدات،

جابەڕاستی ئینسان دەبێ زۆر ئاگای لەخطواتی شەیتان بێ مەسەلەن
ئافرەتێك بەشوێنێك دادەڕوا، ئافرەتێکی رووتە، ئەتۆ دەتەوێ خۆت لێی
بپارێزی، پێت دەڵێ ئەرێ دەبێ خزمەکەت نەبێ، دوای دەڵێ دەبێ ئەو
قوماشە چی بێ لەبەری کردیە، قوماشەکی غەریبە، ناڵێ نەزمرێ بکە، دەڵێ
قوماشەکە غەریبە یان دەڵێ بەفلان نەدەچوو وەی لێ دەکات نەزمرێ بکات
واتە هێدی هێدی لەبۆت دێ سبحان الله پێم خۆشە بزانن، شەیتان زۆر
مەکرو فێڵبازە زۆر بە ئەقل و ژیرانە دێ گوناهت پێ دەکات، هەتا یەك
لەهەنگاوەکانی ئەوەیە گوناه لەزاتی خۆیدا رەش و پیس و بۆگەنی و
ناشرینە ئەو ج دەکات بۆت جوان دەکات بۆت دەرازێنتەوە ئەوەیە خوای
گەورە دەفەرموێ ﴿ وزين لهم الشيطان اعمالهم﴾ سبحان الله بپرسن لەوانەی
توشی گوناهی گەورە بوونە، ئەوانەی توشی زینا بوونە ئەوانەی تووشی
فاحشە بووینە، کاتێك گوناهەکە ئەنجام دەدات یان یەکەم جاری پێش
گوناهەکە ئەنجام بدات، شێت و هار بووە لەبۆ ئەنجام دانی، وەدەزانی ئەوە
خۆشترین شتە لەدونیادا سبحان الله هەر گوناهەکەی ئەنجامدا یەکسەر ئەوە
گوناهەی لەپێش چاوی دەکەوێ حالەتێکی غەریبی بەسەر دادێت بۆ؟
چونکە شەیتانەکە لێی دوردەکەوێتەوە حەقیقەتی ئیشەکەی بەدیار
دەکەوێ ئینجا دەڵێ ئاخ تازە دەستم شکا تازە تووشی بووم، بەڵێ هەر
چەند ساتێکە شەیتانەکە زەفەری پێ دەبات ئیعاز لەدوای ئیعاز تەلەفۆن
لەدوو تەلەفۆن لەبۆ هەوای دەکات وەکو تۆپ تۆپەین گەمەی پێ دەکات
دیسان هەوا ئەمر بەنەفس دەکات، نەفسیش دووبارە ئەمر بەدڵ دەکات
ئیشتهای هەل دەستێتەوە دووبارە ئەو گوناهە بکات بۆیە شەیتان زۆر لەو
ئیشانە شارەزایە بۆیە محمد کوڕی واسع هەزار رەحمەتی خوای لێ، بێ یەك
لە ئەولیایەکانە یەك لەپیاوە سالحەکانە، دوعایەکی دەکرد دەیگوت (( اللهم

انك سلَطت علينا عدوا بصيرا بعيوبنا، إنا هو وقبيله من حيث لانــراهم اللــهم آيسه كما آيسته من رحمتك وقنطه منا كما قنطته من مغفرتك وباعد بيننا وبينه، كما باعدت بين المشرق والمغرب)) دوعايەکی زۆر خۆشە، رۆژێك شەيتان رێی لێگرت پێی گوت قوربانت بم چت دەوێ دەتـدەمی هەرچی ئـەمرێکت دەوێ تەنفيز دەکەم بەس ئەو دوعايە فێرە کەس مەکە، ديارە دوعايەکە ئەوەندە تەئسيری لێ کرديە، شەيتانی پێ تواندیتـەوە پێـی فەوتانـدووە محمد کـوڕی واسـع پێـی گـوت نەعلـەتت لێ بـێ، دەبـێ هـەر کـەس بيگـەمێ فێـری بکـەم بەڕاسـتی ئـەو دوعايـە زۆر بکـەن ئـەو دوعايـە بـڕ بـڕەی پـشتی شـەيتان دەشکێنێ خۆشەويستانم ئەم شـەيتانە بـۆ خـۆی ئـيعتراف دەکـات، دەڵێ خـۆ من سەيتەرەم لەسەر ئێوە نەکردبوو، خـۆ مـن هـيچ ئـەمرم پـێ نـەدەکردن، ئـەو ئيـشە بکـەن دەڵـێ مـن ئيعـازەکم دەدانـێ ئێـوە بـەدوای مـن دەکـەوتن، ئەوەتا بزانە خوای گەورە بۆ خۆی ئەو حەقيقەتەی روون کردۆتـەوە باسـی ئەوە دەکات لەقيامەتێ کەهەموو عالەم زيندوو بۆتـەوە، شـەيتانيش لەگـەڵ بـاقی ئـەو خەلکـەی زينـدوو دەبێتـەوە، شـەيتان بەخەلکەکـە دەڵێ، دەبێتـە خـەتيب وەکـو ئيمـامی رازی دەڵێ (عجبـاً للـشيطان صـاراً خطيبـاً) دەچێتە جێگايەکی بلند، ئەو هەموو خەلكە ئەو هەموو ئۆمەتە کەبەدوای کەوتينـە هەمووی توشی واوەی لابوونە لەو قيامەتە، چيان پێ دەڵـێ ﴿قـال الـشيطان لما قضيَ الامر..﴾ تەماشا شەيتان بەو خەلكە دەڵـێ کاتێـك ﴿ قـضيَ الامـر﴾ کۆتايی هات، قيامەت هات هەموو شتێك کۆتايی هات ڕاسـتی بـەديار کـەوتن ﴿ ان الله وعـدکم وعـد الحـق﴾ وەعـدی خـوای گـەورە حەقـە، خـوای گـەورە وەعدی بەئێوە دابوو، بەهۆی پێغەمبەر و قورئان، کە رۆژی قيامـەتێ دادێ، ئێـوە بڕواتـان نـەدەکرد ئێـوە فەرمۆشـتان کـرد ئێـستاش ئـەوە بەڕاسـتی تووشی بوون ﴿وعدتکم فاخلفتکم﴾ بەلام شەيتان دەڵێ من وەعـدم پێـدان،

بەڵام وەعدی چی ئێوە دەمبینن حاڵم زۆر لەئێوە شڕترە، مـن موخالەفـەی وەعدی خۆم کرد، دونیام بۆ رازاندنەوە، گوناهم لەپێش چاوتان شیرین کرد قیامەتم لەبیربردنەوە بەڵام ئەمن موخالەفەی وەعـدی خـۆم کـرد ﴿و اکـان لى عليكم سلطان﴾ خۆ هیچ دەسەڵاتم لەسەر ئێـوە نـەبوو ﴿ الا ان دعـوتكم فاسـتجبتم لـي﴾ تـەنها ئیعـازەکم یـان تەلەفۆنـەکم یـان فاکسەکم دە کـرد بەدوای من دەکەوتن، ئێوە ئیتاعەی منتـان دەکـرد ﴿ فلا تلومـوني و لومـوا انفسكم﴾ نەکەن لۆمەی من بکەن، نەکـەن لـەلای خـوای گـەورە بلـێن، ئـەوە شەیتان پێی کردین، بـەلکو بـۆ خۆتـان کردیتتـان، بـۆ خۆتـان ئـەو ئیشەتان کردیە، قسەیەکی زۆر خۆشم بەبیرهاتەوە ئێمـە قوتـابی بـووین لـە کولیـەی شەریعە لەبغداد یەکێك لەقوتابیەکان قۆپیەی کرد، مامۆستا یەکسەر گرتـی کە گرتی دەرسێکی حەساس بوو، پۆلی یەکەمی کولیە بووین مامۆستا گـوتی ئەوە بـۆ قۆپیـە دەکـەی، ئـەویش کـورد بـوو هـیچ عـەرەبی نـەدەزانی گـوتی (استاذ فعل بـي الـشيطان) گـوتی شـەیتان پێـی کـردم، جـا بەڕاسـتی شـەیتان ئەمرت پێ ناکا ئەوە بکە، بەلکو ئیعازت دەداتێ وەس وەسەت دەداتێ، تـەنها بـەئیعاز بەتـەرەدودی خـۆی وەت لێ دەکـات، ئـەو ئیـشانە ئـەنجام بـدەی، جـا خۆشەویـستانم مـادام پـەتی شـەیتان ئـەوا کورتـە ﴿ان کیـد الـشيطان کـان ضـعيفا﴾ توخـوا بـۆ وابکـەین هـەوامان تـەسمیلی بکـەین، بـۆ ئـەو تەنزیمـە داخلیە ئاشکرا نەکەین و هەر هەموویان نەفەوتێنین، جا ئەو هەوایە دەبـێ زۆر ئاگات لێبێ، هەوای تۆ لەگەڵ هەوای زاڵمان و گوناهبـاران یـەك نـەگری، بۆیە گوتیانە پیاو سالحێك فلانە زاڵم مەدحت دەکـات، گـوتی قـورم بەسـەر، ئەبێ چ هەوایەکم لەگەڵ هەوای ئەو جووت ببێ یەکی گرتبێ، جا وریا بـین کەینێ شەیتان رقی لەئێومیە، کەینێ زالمان و خوانەناسان و بێ دینان رقیان لە ئێومیە، دەبێ بزانن ئێوە مەزبوتن، هەواتان غـەیری هـەوای وانـە، بـزانن

هەوای وان جەهەننەمیە شەیتانیە، هەوای ئێوە بەرەو خوای گەورەیە، بەرەو قورئانە، بەرەو روناك و نوور و بەرەکەتی رب العالمین دێتن، جاخۆشەویستانم ئەوە حەقیقەتی ئەو ئینسانە بوو کە باسمان کرد، ئەو هەموو شتەی کە باسمان کرد، ئەو شتانە بوون کە لەناخی ئینسانەکاندا وا ئەجولێنەوە ئیش دەکەن ئەو ئینسانە بەرێوە ئەبات، بەلاّم خوای گەورە لێ ناگەرێ ئەو شەرو ئاژاوەو ئەو شەرە خوێناویە لەناو ئەو ئینسانە رووبدات، بەبێ ئەوەی مەدەدو یارمەتی خۆی بنێرێ، نەخێر ئەم مرۆڤە بەجێ ناهێلی کەواوەیلاییبێ نرکەو نالّەی بێ، لەبن دەستی نەفس و هەواکەی ، خوای گەورە چۆن ئاوا بەجێی دێلێ! عەبدێك خوای گەورە بۆ خۆی دروست کردبێ، جا خۆشەویستان ئەو کەون و کائیناتە هەموو بۆ تۆ دروست کراون، تۆش بۆ خوا دروست کراوی، رۆژ و مانگ و شەو هەمووی خزمەت کاری تۆنە دەی تۆش دەبێ خزمەت کاری خوای گەورە بی، جا خوای گەورە چۆن بەجێت دەهێلی، چۆن لێت دەگەرێ بەتەنیابی بەلکو بەدڵ و بەعەقل و بەزانست خوای گەورە یارمەتی ئێمەی داوە، کە بتوانین مسەیتەربین و بتوانین خۆمان زەبت بکەین و لەو شەرە خوێناویە بێینەدەرەوە ئیمان و حەق و راستی بەسەر بکەوێ و باطل و نەفس و هەوا ژێر بکەوێ، جا خۆشەویستانم یەکەمین چارەسەر زانستە، یەکەمین چارەسەری ئێمە ئەوەیە بەزانست بەراستی بەزانست دل منەوەر دەبێ عەقل رۆشنا ئەبێ رووناك ئەبێتەوە، ئەگەر دڵ منەوەر بوو عەقل رۆشنابوو، ئەگەر ئەو دووانە رێك و پێك بوون، ئەوا نەفس و هەوا تەسمیل دەبن خۆ ئەدەن بەدەستەوە چی خوا پێی خۆشە ئەوا ئەبن.

بەراستی ئێمە پێویستمان بەزانستە پێویستمان بەزانینە، تەماشاکە لەئومەی ئیسلامی دەبێ تۆ عالم بی یان متعلم بی واتە طالب علم بی یان

دەبێ دانیشی گوێ بیست بی ، نابی چوارەم بی چونکە بەهیلاك دەچی، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ (کن عالما او متعلما او سامعا فلا تکن رابعا فتهلك) واتە: یان عالم بە واتە زانابە زیرەك بە، ئەهلی علم بە یان طالب العلم بە برۆ بگەرێ شت وەربگرە لەسەر چۆك دانیشە، بەرامبەر مامۆستاکان بخوێنە، ئەگەر ئەو ئیمکانیەشت نەبوو دانیشە گوێیان لێ رابگرە لەمەجلیسیان نزیك بەوە، نەبیتە چوارەم چونکە عایدی نەفس و شەیتانە بەهیلاك دەچێ، کەواتە دەبێ ئێمە لەوسێ حالەتە دابڕین ئەهلی حەق بین، ئەوە زۆر گرنگە بەڕاستی ئەمڕۆ تەماشادەکەین (عالم)مان کەمە بەپەنجەی دەست دەژمێردرێت، طالب علمیشمان کەمە گوێ گریشمان هەر نی یە ، هەتا دامە هەبێ هەتا سورانی بێ فایدە هەبێ، هەتا پیاسەی سەر چنارو ئەسواق سیروان هەبێ، ئەو لەدوو ئەوەی ناگەڕێ، دوو حەرف فێر بێ گوێگر بی ئیستفادە بکاتن، دەی کەواتە (فتهلك) پێغەمبەر ﷺ گوتی نەبن بەبەشی چوارەم بەهیلاك دەچن، ئەو خەلکە هەموو بەشی چوارەمن، لەبەشی چوارەم دەژین و بەهیلاك چوونە، جا خۆشەویستانم بەڕاستی بەو زانستە ئینسان خۆی دەدۆزێتەوە، کە خۆت دۆزیەوە خودای گەورەش دەدۆزیتەوە کەخودات دۆزیەوە قیامەتت دەدۆزیەوە ڕێی راست دەدۆزیەوە حەق و ڕاستی و پاکی و ڕێکی دەدۆزیتەوە بەلام بەخوا زانستت نەبێ خۆت وون کردوە ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنسَاهُمْ أَنفُسَهُمْ﴾ (الحشر/١٩)، خوای گەورە دەفەرموێ وەکو ئەو کەسانە نەبن کە خوایان لەبیر کرد، کەخوای لەبیر کرد خۆی و قیامەتێ لەبیر ئەکا کە خۆی و قیامەتی لەبیرکرد، تەواو ئەو ئینسانە مایەی خێرو چاکەو رەجای شتێکی خێری لێ ناکەی، جائیمامی شافعی رەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێ (من اراد الدنیا فعلیه بالعلم ومن اراد الاخرة فعلیه بالعلم ومن اراد الدنیا فعلیه بالعلم)

دەفەرموێ کەسێك دونیای دەوێ باخـەریکی زانـست بـێ، کەسێك قیامـەتی دەوێ باخــەریکی زانــست بــی کەســێك دونیــاو قیامــەتی دەوێ باخــەریکی زانست بێ، بەڕاستی ئێمە بەزانست دەتوانین بگەینە هیوا و ئاواتی خۆمـان، بە زانست و زانیاری ئەتوانین بگەینە مەبەست و ئامـانجی خۆمـان، جائێمـە ئێستا هەدەفی ئێمـە چیە ئیسلامی خۆمانـە ﴿ان الله لا یغیر مـابقوم حتـی یغـیروا مـا بأنفـسهم﴾ هـەتاخۆمان چانەکەین ناگەینـە مەخـسەدی خۆمـان، کە(بەهشتی بەرین و رەزامەنـدی خوایـە) کەواتـە بەختـەوەری دونیـا چۆن بەدەسـت بـێ بـە گـۆڕان و گۆڕانەکـەش لـەکێ؟ لـەخودی خۆمـان دەسـت پـێ بکـەین، لـە کـوێ دەسـت پـێ بکـەین لـەعلم و زانـستەوە، دەبـێ بەزانـستەوە دەست پێ بکەین، ئەمەش لەکوێ سەرچاوەکەیتی لەقورئان و لەفەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرین.

تـاکو دەرسـێکی تـر بـۆ چارەسـەرکردنی ئەوانـەی گـوتم بـەخوای گـەورەتان دەسپێرم خواتان لەگەڵ ..

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

ئـازیزان خۆشەویـستان .. موسـلمانانی بـەڕێز عـەودالانی بەهەشـتی بـەرین سەلام و ڕەحمەت و میهرەبانی خوای گەورە بـڕژێ بەسـەر دڵـی هـەمووماں، یارەبی خودایە لەبۆ خاتری ناوە جوانەکانت لەگوناهەکانمان خۆش ببی.

یـارەبی خودایـە عـەفومان بکـەی، خودایـە دڵمـان بـەنووری خـۆت منـەوەر بکەی، یارەبی خودایە دڵێکی سەلیم و مطمئنمـان بەقـسمەت بکـەی، یـارەبی خودایــە شــەیتانی مــەلعونمان لــەکۆل بکەیتــەوە، نەخــشەو پیلانــەکانی بەرامبــەر ئێمــە هــەمووی پۆچــەل بکەیتــەوە نــەتوانی زەفــەر بەئێمــە ببــا یارەبی خودایە لەبۆ خاتری ناوە جوانەکانت، لەبۆ خاتری ئیـسمی عـەزەمت لێـت ئەپاڕێمـەوە کـەوا پـشت و پـەنای موسـلمانان بـی، بـۆ ئـەوەی بەسـەر هەموو دوژمنانـدا وە خاصەتەن لەژورێ دا لەسەر نەفس و هـەواو شـەیتاندا سەربکەون، یـارەبی خودایـە لـەبۆ خـاتری ئیـسمی عـەزەمت ژیـانێکی وامـان بەقسمەت بکەی کە تۆ لەو ژیانەمان رازی بی یا ارحم الراحمین.

ئازیزانم لەچوار دەرسی پێشوو باسـی ئـەوەمان کـرد کـە ئینـسان موبتەلایـە بەچوار شت، بەو چوارشتانە ئینسان دەگۆڕێ و ڕێك و پێك دەبێ ئەم چوار شتەیە موسلمانان لەرێگا لادەدات و توشی شرك و کـوفرو بـێ دینـی دەبێـت، جائێمە هاتینە سەر ئەوەی کە ئایا چارەسەری ئێمەی موسلمانان چیە؟ ئایـا چارەسەری عەقل و دڵ و نەفس و هەوا چیە بۆ ئەوەی چارەسەریان بکەین و ئەهلی صراط المستقیم بین وەئەهلی ڕێبازی موسـلمانی موەحیـدو ڕێـك و

پێك بین، وەچۆن لەگەڵ خودا ناسان رێك بکەوین چۆن لەگەڵ خوداناسان بەرێبکەوین، تائەگەینە مەنزلگەی خۆمان کە بەهەشتی بەرینە انشاء الله ئازیزان بۆ چارەسەری یەکەمینیان لەدڵ ڕا دەست پێ دەکەین، لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی ئێمە نەخۆشین ئەبێ بچینە لای دکتۆر و دکتۆری ئێمەش محمد المصطفى ﷺ جواب دەداتەوە ئاگاداربن..ئاگاداربن لەناو لاشەی ئێوە پارچە گۆشتێك هەیە ((ان في الجسد مضخة اذا صلحت الجسد كله واذا فسدت فسد الجسد كله الا وهي القلب)) دەفەرموێ ئاگاداربن لەناو لاشەی ئێوەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر ئەم پارچە گۆشتە صالح و رێك وپێك بێت هەموو ئەندامەکانت رێك و پێك ئەبێ، ئەما خوانە خواستە ئەم پارچە گۆشتە نارێك بوو ئەوا هەموو ئەندامەکانت نارێك و فاسد دەبێت، جا دکتۆرمان محمد ﷺ بەئێمە دەڵێ لەدڵ رادەست پێبکەن، ئەگەر دڵتان سابت و رێك و پێك و منەوەر بوو هەموو ئەندامەکانتان تابعی دڵتانن چونکە دڵ پایتەختی مەملەکەتی ئینسانە، جا ئەگەر عاصیمە رێك و پێك بوو کە خەلیفە لەوێ دادەنیشێ ئەگەر ئەوامری خلیفە رێك وپێك دەرچوو وەبەخۆی مەملەکەتی دڵە کەێك و پێك ئەبێت، بەلاَم خوانەخواستە پایتەخت مەشاکلی تێدا بێ، فەوزاو هەراو ئاشوب و شەڕی تێدابێ، باقی ئەندامەکانی تر ئیستقرار و ئەمن و ئاسایش نایان گرێتەوە، جا بۆیە ئێمە بەگوێی محمد المصطفى بکەین ﷺ لەدڵەوە دەست پێ ئەکەین.

بزانین ئەم دڵە چۆن ئەبێ، بزانین خوانەخواستە کەسێك توشی دڵێکی ڕەش و مردوو هاتبێ، چۆن چارەسەری ئەکرێ لەپێشەکی دا دکتۆرمان محمد ﷺ پێمان دەفەرموێ ((تعرض الفتن على القلوب كالحصير عوداً عوداً))ئەو خۆشەویستە، تاجی سەرمان نوری چاومان صلاە و سەلامی خوای لەسەر بێ، ئەفەرموێت فیتنەو غەم و پەژارەی دونیا رووله ئینسانی

ئیمانـدار دەکـات، بـەڵام روو لـەدڵی دەکـا، روو لـەلاق و دەسـتی نـاکـا، بـەلکو دەفـەرموێ ((تعـرض الفتنــة علـی القلـب)) یەکـسەر ئـەم فتنانــە روو لـەدڵ دەکەن، چـونکە فیتنـەکانیش ئـەزانن ئەگـەر دڵ داگـیر بکـەن، ئـەو ئینـسانە دەست بڵند دەکاو تەسـلیم ئـەبێ، جـا ئەفـەرموێ کحـصیر وەك ئـەو حـصیرە وایە کەلەسەری دادەنیشین، ئەو حصیرە دەزانـن هـەموو پـەلك پەلكـە لـەناو یەكن، دەفەرموێ فتنە واروو لەدڵی ئیمانداران دەکـاتن وەکـو حەصـیر عـوداً عودا، دانەدانە حەصیرەکە لەبۆ دڵـی ئـەم ئیمانـدارە ئەچـێت، جادەفـەرموێ (فأي قلب اشربها نكـت فيهـا نكـت سـوداء) دەفـەرموێ هـەر دڵێـك ئیـستقبالی ئەم فیتنەی کرد، لەگەڵ ئەو فیتنەیە کـونی کـرد و برینـداری کـردو چـووە ژوورەوە ئەفەرموێ خاڵەکی رەشی لێ پەیدا ئەکا ( اي قلب انكرها نكـت فيـه نكت بيضاء) دەفەرموێ هەر دڵێکیش ئەم فیتنانەی رەت کـردوە، ئیـستقبالی ئەم فیتنانەی نەکرد، پەنجەرەو دەرگاکـانی داخـست بـۆ ئـەوەی توشـی هـیچ فتنەیەك نەبی، ئەوا خودای گەورە خۆی محفوظی ئەکات، کە ئەم دڵە خۆی پاراسـتووە لـە فیتنەکـە، تاتووشـی نـەبێ توشـی نـاو دڵـی نـەبێ دەفـەرموێ منەوەری ئەکا ئەم دڵە توشی خـاڵی سپی ئـەکاتن هـەتا ئـاخیری دەفـەرموێ (حتی تسيرو علی قلبين ) دەفەرموێ دڵەکان دەبێتە دوو چین دەفەرموێ ( علی الابيض مثل صفاء) هەندێ دڵی سـپـیـیە وەکـو بـەردی صـفا وایـە ( فلا تـضره الفتنــة مادامــت الـسموات والارض) تـازە خـوای گـەورە ئـەم دڵـەی مونەوەر کرد بەنووری خۆی، هەمووی سپی کردەوە وەکو بەردی صـەفای لێ کرد، ئەفەرموێت تازە فتنە تەئسیری لێ ناکات تەواو ئەم دڵە دامەزراو بـووە بەدڵی مطمئن، بەدڵی سەلیم ئەم دڵە دائەمەزرێ هیچ فتنەیـەك تـازە هـەتا رۆژی قیامـەتێ ئەئـسیری لێ نـاکـات، پاشـان دەفـەرموێ (واما الآخـر فيكـون اسود) بەڵام ئەو دلانەی کە فیتنەی وەرئەگرن، ئەو دلانەی کـە دەرگـەکان و

پەنجەرەکانیان دانەخستوە بەرامبەر فیتنەی ئەو زەمانە ڕەش دائەگەڕێن (لایعرف معروفاً ولا ینکر منکرا) ئەم دڵە سیفەتی وای لێ دێ نەچاکە ئەناسێ نەخراپەش ئەناسێ ( الا ما اشرب منه هواه) تەنها ئەم دڵە چ ئەناسێ ئەم دڵە ڕەشە هەواو ئارەزوو نەفسی چی بووێ بەدوای ئیتاعەی نەفس و هەوای خۆی ئەکاتن جا خۆشەویستانم ئەلێرەدا پێغەمبەرمان ﷺ بەئێمەی ڕاگەیاند دڵەکان دوو جۆرن، دڵێك سپی دڵێکیش ڕەش جا ئەم سپیانە جۆر جۆرن هەیانە زۆر سپینە هەیانە لەوی سپی تر، دەرەجاتن ئەم دڵانەش، بزانین دەرەجاتی ئەو دڵە سپیانەش چۆنن، شتێك هەیە ئەبێ بزانین ئەو دڵە سپیانە وانەبێ توشی موعانات و دەردو ئیش و ژان و ناخۆشی نەبن، چونکە ئەو دلانە هەور دەیانگرێ، چۆن مانگ بەو جوانیەو ڕەونەقیەو جەمالیەی خۆیەوە کەجار بەجار هەور ئەیگرێتن دڵیش وەکو ئەم مانگە جوانە هەور بەری ئەگرێتن چونکە فیتنە ئەوەندە زۆرە، غەم و پەژارەی ئەم دونیایە ئەوەندە زۆرە فیتنەی ئاخیر زەمان و فیتنەی وەرگەڕان لەدین و فیتنەی خوا لەبیر چوون و فیتنەی بەدوای دونیا کەوتن ئەوەندە زۆر بووە، بەڵام ناچێتە ناو دڵەکان بەڵکو پێشیان ئەگرێ، جا ئەم دڵانە چەند جۆرێکن هەندێك هەنە وەکو ئەم هەورەی بەرامبەری مانگ وایە جار وایە ئەم مانگە قەپات دەکات بەڵام بۆ ماوەیەکی کەم، هەورەکە لائەچێ و شەوق و جوانی ئەو مانگە بەدیار ئەکەوێتەوە، هەندێکیشان هەیە لایەکی ئەگرێ هەورەکە هەمووی ناگرێ تۆزێکی ئەگرێ تۆزێکی لەدەرەوەیە، هەندێك هەوریش هەنە بەخۆی تەنکە، ئەگەر مانگەکەش بگرێ ڕەنگ و شوعاعی و تیشکی مانگەکە لەو دیوی هەورەکەش هەر دیارە، جا بۆ یە ئەم جۆرە دڵەی ئێمە وەکو ئەم مانگە ئەگیرێت، جا دڵ هەیە دەبینین هەور هەمووی دەگرێ، بەڵام کەمێکە و لائەچێ ئەم فیتنەیە زۆر

بـــەر دەوام نـــابێ هەندێکیـــشان تـــۆزێکی دڵ ئـــەگرێ تـــەمووی نـــاگرێ بەپـــشتیوانی خـــوای گـــەورە، بـــەئاگا لـــەخۆبوون و بـــەقورئان خوێنـــدن و تەزکیەی نـەفس ئـەوەش لائەکـەوێ، هەنـدێکیـشان هەورەکـە دەیگـری بـەس هەورەکە زۆر پەیت و تۆخ نیە بۆیە شەوق و ڕەنگی ئەم دڵە هەر بـەردەوام دەبێ تاکو ئەو هەورەی لائەداتن، جا بۆیـە پێغەمبـەرمان ﷺ دەفـەرموێ (( مامن قلب الا وله سحابة كسحابة القمر)) هـیچ دڵێـك نیـە لـە دڵـە سـپیەکان ئیلا هـەورێکی وەکـو هـەورێکی مـانـگ لـە دەوری کـۆ ئەبێتـەوە جـار بـەجار بەسەری دادێ ابـن القـیم الجـوزی هـەزار ڕەحمـەتی خـوای لێ بـێ کەیەکێکـە لـــەزانا بـــەرزەکان کەبەڕاســـتی زیـــرەك بـــوو لەنەخۆشـــەیەکانی دڵ و چارەسـەرکردنیان دەفـەرموێ حالـەتی ئـەم هـەورە لەگـەڵ دڵەکانـدا چـەند جۆرێکە (هەیە زوو دێ بەڵام زوو بەری ئـەدا) هەیـە زوو دێ بـەڵام درەنـگ بـەری ئـەدا هەشـە درەنـگ دێ هـەورەکان درەنـگ بەسـەر دڵـی دادێ بـەڵام دەفەرموێ زوو بەری ئەدا وەهەندێکیـشیان درەنـگ دێـن و بـەڵام درەنگیش بەری ئەدا جا باشترینیان ئەوەیـە ئەگـەر درەنـگ بـێ و زوو بـەری بـدات وە خراپترنیشیان ئەوەیە کە ساحێبەکەی زۆر پێ ماندوو دەبی، ئەوەیەکە ئـەو هەورە زوو بێ بەڵام درەنگ بەری بداتن.

جـا خۆشەویـستانم ئـەوە شـێوەو حـاڵی دڵ بـوو دڵـە سـپیەکانە لەگـەڵ ئـەو سپیەیەو بێ گەردیەش دا تووشی ناخۆشی و تووشی تاقیکردنـەوە و تووشـی ئەزیـەت و ئـازار دەبێـت، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ (( بعـضها اوعـی مـن بعض)) دڵ هەندێکیان لەهەندێکیان گەورەترن و قەیمترو چاکترن، جا دڵـە سـپیەکانیش هـەر یـەکیان لەیـەکیان بـەقوەترە چـینێکیان لـە چـینێکیان ثابترەو منـەوەرترەو روونـاك تـرە، لەهـەموو دڵەکان منـەوەرترو ڕێـك تـرو جوانترو پوخت ترو لە خواترس تر دڵی مطمئنە ئەم دڵە دڵێکی بێ گەرد و

دڵێکـه پـاك و دامـەزراو لەغـەیری خـوا، هیـچی تـری تێدانیـە لەغـەیری ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە هیـچی تـری تێدانیـە لەغـەیری خواپەرسـتی و تاعـەتی خـواو پێغەمبـەر ﷺ هـیچ مـرازو مەقسەدێکی تـری نیـە ئـەو دڵـە خـوای گـەورە وەصـفی دەکـات دەفـەرموێ ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ٢٨﴾ (الرعد٢٨)، واتـە: ئـەو کەسانەی کە ئیمانیان هێناوە پاش ئیمانەکەی هەولیان دا، تەزکیەی نەفسی خۆیان بکەن دڵی خۆیـان پـاك بکەنـەوە لـە هـەموو ئـەو ڕەشـاتیە، لـەکوفرو شرك و مەعصیەت و گوناهو خاڵی ڕەشی تیادایە پاکی بکەنەوە ئەوانـە ئـەم دڵانـە بـەزیکری خـوا زۆر ئیطمئنـان ئـەبن، بـەم دلانـە زۆر نـاو دەخۆنـەوە بەزیکری خوا ئاگاداربن زیکری خوا ئیطمئنان بەدڵ دەبەخشێت جا کاتێـك ئینسان زیکری خوای کرد و لەگەڵ زیکرەکەی حالەتێکی ئیطمئنـانی تـووش بوو، ئەو مژدەیە دڵت لەدڵە مطمئنەکانە وا دەیەوێ ببێ بەو دڵەی کـەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشیان دەوێ، جا خۆشەویستانم دڵی مطمئنـە دڵێکـە ساحێبەکەی زۆر پێ ماندوو بووە تاگەیشتیتە دەرەجەی ئیطمئنان، چونکە ئەو لوتکەی دڵە خاوێنەکانە ئەم دڵە نزیکە لەعەرشی خودا، ئەم دڵە نزیکە لەخوا ئەم دڵە پر بووە بە نوری خوای گەورە جا ئـەم دڵـە دائیمـەن دڵێکی مرتاح و مطمئن و دڵێکە نەمشەوەش ئەبێ دڵێکە نەغـەم و پـەژارەی دونیـا نەیگرێتـەوە وەك دۆلار دابـەزی دۆلار بڵنـد بـوو ئەوانـە هـیچ تەئـسیری لێ ناکات لەبەر ئەوەی غەم و پەژارەی ئەم دڵە ئەوەیە کە لەبەهەشـتێ بەسـەر بکـەوێ، لەبەهەشـتێ بگاتـە بەفیردەوسـی ئـەعلا لەبەهەشـتێ لەخزمـەت پێغەمبـەر ی دابنیـشێ ﷺ نـەك غـەم وپـەژارەو وردو زیکـری هـەر ئـەوبێ، دۆلار هەستی و دۆلار دابەزی گـرانم فرۆشـت هـەرزانم بەدەسـت کـەوت، جا

خۆشەویستانم ئەم دڵە دووسیفەتی هەیـە، **یەکەم سیفەتی** ئـەم دڵـە ئەومیـە کە هیچ شك و گومانی تێدانیە لە بـوونی خـودا لـەبوونی قیامـەت لەڕاسـتی قورئان و ڕاسـتی پێغەمبـەر ﷺ، ئـەم دڵـە دڵێکە ئیطمئنـانی پەیـدا کردیـە سەد لەسەد کە خوای گەورە هەیە، کە ڕۆژی قیامەت هەیە زینـدوو بوونەوە هەیە کەسزای قەبر هەیە هەروەها یەقینە پێغەمبەر محمـد المـصطفی ﷺ پێغەمبەر ی خودایـە ڕەوانـە کـراوی خودایـە، ئـەو قورئانـەی کەهێناویـەتی کەلام و قسەو گتفوگۆی خـوای گەورەیـە، جـا خۆشەویـستانم ئـەو دڵـە هـیچ کاتێـك شـك و گومـانی تـێ ناکـەوێ، قەلـەق و بـێ سـەرو بـەری تـێ ناکـەوێ لەبـەر چـی چـونکە ئیمـان و یـەقینی لـەدڵ دایـە، ئـەو ئیمـان و یەقینـەش لەقورئان دەری هێناوە کەقەناعـەتی سـەد لەسـەد بەومیـە کـە ئـەو قورئانـە کەلامی خودایە دەی ئەو قورئانە شتت ئـەداتێ شـتت پـێ نیـشان ئـەدا ڕێـت پێ نیشان ئەدا بەرەو بەهەشتت ئەبا بەرەو سەر بەرزی و کامـەرانی دونیـاو قیامەتت ئەبا، **دووەم سیفەتی** ئەم دڵە ئەومیە کاتێك کەتووشی موسـیبەت و غەم و پەژارەیەك هـات موشـەوەش نـابێ، کوفرو شـرك و قـسەی ناشـرین و ناشوکری لەدەم نایەتە دەرێ، بەلکو ئەزانی'ئـەم دونیایـە شـوێنی ئیبتلایـە، دەزانێ دونیای ئیمتحانە هەر دەڕوا لازمە لەسەری بەرگری هەبێ بەرامبـەر هـەموو ئـەو موسـیبەت و غـەم و پەژارانـەی کەتووشـی دەبـێ، کـۆڵ نـەدا بەتایبەتی لەزروفێکی ئاوا کە ئێمە تیادا دەژین، هەر هـەمووی، غەمـە سـەر تاپای ژیان غەمە ماڵ و منداڵ غەمە، خێزانت غەمـە ئیـشت غەمـە، پـارەت غەمە، خزمت غەمە، هەبوونی غەمە، نـەبوونی غەمـە، ئـیش دەکـەی ئـیش ناکەی هەمووی غەمە سبحان الله ئەم زروفەی ئێمە بۆ هەر هەمووی غەمـە منداڵی دوێنی دەبینـی هـەموو مـووی سـپی بـووە سـبحان الله لێـی ئەپرسـی، دەڵێ مامۆستا گیان هەر غەم ئەخۆم وەختـە نـان و غـەم سـێ جـەم پێکـەوە

بخۆین، جا خۆشەویستانم زروفێکی ئاوا پڕ بەغەم و پڕ لە ئەشکەنجە و ئازارو ماندوو بوون، چەند ماندوین ئێمە یەك دەقە ئیسراحەتمان نیە، وادەزانین پەنجا خێزان بەخێو دەکەین، ئەوەندە ماندووین ئەوجا بەهیچ راناگەین، ئینجا ئیشەکانیشمان هەر تەواو نابێ، کەسێك دەبینین دەدەقە قسەی لەگەڵ بکەی دەڵی وە(الله) ئیشم هەیە، هیچ ئیشی دیار نیە هەزار ئیشی لەپێشە هیچ ئیشی دیار نیە ئەمە هەمووی غەمن، ئەم زروفەی کە ئێمە تیادا دەژین زروفێکە بە خوا ژیانێکە دوورە لەحەقائیق و ڕاستی ئەم ئیسلامە ژیانێکە دوورە لەتەحکیمی شەریعەتی خوای گەورە ژیانێکی تاڵە ﴿ ومن اعرض عن ذكري فان لە معيشة ضنكا﴾ بەڕاستی ژیانی ضە نکا هەمووی غەم و پەژارەیە بۆ ئەو هەموو غەم و پەژارانە ئەم هەموو تاقیکردنەوە و ئیبتلایە ئەبێ سەبری هەبێ ئارامی هەبێ لە سەر خۆیی هەبێ، ناشوکری لەدەم نەیەتەدەرێ، باوکی مرد، کوڕی مرد زەرەری کرد ، توشی موسیبەتێك بوو نەخۆش کەوت هەر موسیبەت و بەڵایەك هاتە سەر رێی ئەبەدەن ناشکوری ناکا، بەلکو خۆی تەسلیمی رب العالمين ئەکا، بەدلەکەی خۆی ئەڵێ ئەی دڵ وریابە نەشێوێی وریابە لێت تێك نەچێ ئەو تاقیکردنەوە تاقیکردنەوەی خوایە سەبری من لەسەر ئەو تاقیکردنەوە ئەوەندە دەرەجەم بەرزدەکا لەبەهەشتدا، جا خۆشەویستانم ئێستا بابێین بۆ ئەوەی ببین بەخاوەن ئەم دڵە دەبێ چەند شتێك بکەین، یەکەمین دەبێ یەقین و قەناعەتێکی سەد لەسەدی بۆ خۆمان دروست کەین بەرامبەر خوداو هەبوونی رۆژی قیامەت و بەرامبەر قورئان و پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە زۆر شەرتە، بەوەهیچ شك و گومان لەدڵی نامێنی، بەڕاستی کاتێك ئینسان شك و گومانی هەبێ زۆر، تەماشاکە خودا جل جلالە ئەو کەوت و کائیناتەی دروست کردیە بەئیمە دەڵێ فکر کەنەوە بیربکەنەوە لەو

کەونەی بۆ ئەوەی ڕاستی خوداتان بۆ بەدیار بکەوێ بۆ ئەوەی گەورەیی و عەزەمەت و هێزو دەسەلات و زانایی منتان دەست بکەوێ من بناسن، بەڕاستی ئینسان خوا ئەناسێ بەو کەونەوە بەبوونەوەردا بۆیە خوای گەورە بۆ خۆی ئەفەرموێ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ...... ﴿٥٣﴾ فلصت/ ٥٣، واتە: ئێمە ئایەت و نیشانەی عەزەمەتی خۆمانیان پێ نیشان دەدەین ﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ لەکەون و کائینات دا تەماشا کەن و فکر کەنەوە ﴿ وفي انفسهم﴾ لەنەفسی خۆیان پێیان نیشان دەدەین ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ﴾ هەتا بۆیان بەدیار بکەوی٘کە خوا حەقە پێغەمبەر حەقە و قورئان و ڕۆژی قیامەتیش حەقن، جا خۆشەویستانم ئێمە فکر ناکەینەوە بەڕاستی فکر کردنەوە عیبادەتێکی زۆر گەورەیە، یەك سەعات فکر کردنەوە لەعەزەمەتی خوا لەبوونەوەر لەو شتانەی کە خودا دروستی کردون خێری عیبادەتی شەست ساڵی هەیە، شەست ساڵ نوێژو ڕۆژی بکەی موقابلی یەك سەعات دانیشە فکر لەعەزەمەتی خوا بکەوە فکر لە بوونەوەر و لەدەوراوپشتی خۆت بکەوە، خوای گەورە بۆ خۆی دەفەرموێ ئێوە فکر ناکەنەوە لەشاخەکان ئێوە فکر ناکەنەوە لەبەحرەکان ئێوە فکر لەخۆتان ناکەنەوە ﴿ ام علی قلوب اقفلها﴾ دڵتان قفلی لێ درایە، مەجالی فکرکردنەوەتان نیە، بەڕاستی ئینسان بەفکر کردنەوە ئەگاتە دەرەجەی یەقین کەگەیشتی بەدەرەجەی یەقین، ئەوجا تامی خواناسی دەزانیت، ئەو جا ئەو دڵەی تۆ هەست بە خوا ئەکا هەست بەتام و لەزەتی ناسینی خوای

گەورە دەکا وە (الله)ی دەتوانم بلێم سەدا نەوە دمان تام و لەزەتی خواناسینمان نەچێشتوە، ئای چەند تامێکی خۆشەبەڕاستی مەحرومین بەڕاستی بێ بەشین، بەڕاستی غەریبین بەڕاستی، ئەو کەسانەی ئەو تامەی نەکاتن داماون ، بۆیە عاریفان ئەلێن (مساکین اهل الدنیا) غەریبن و فەقیرن ئەهلی دونیا (خرجوا من الدنیا وماذاقوا أطیب مافیها) دەفەرموێ ئەو عاریفان و خواناسانەی ئەلێن بەڕاستی خەڵك غەریب و فەقیرە لەدونیا، خۆشترین ژیان لەو دونیایە ئەوەبوو کە ناسینی خودات هەبێ لەدڵ، ئەویشیان نەبوو، جا خۆشەویستانم تۆ کاتێك ناسینی خودا لەدڵت هەبێ لە مێشکت هەبێ، کە فکر ئەکەیتەوە باشە بۆ فکر لەو ئەستێرانە ناکەیتەوە سبحان الله ئەو هەمووە مەلایین ئەستێرە یەکیان لەیەکیان نەدا، ئێمە بەو هەموو سەیارانەی هاتووە رۆژێ بەردەوام پێك دادان روودەدات هەموو سایەقی لەسەرە خۆ، ئەو ئەستێرانە کەس سایەقی نیە بەلام لەسەر یاسایەکی رب العالمین دەسورێتەوە کەبۆی داناوە ﴿ وکل في فلك یسبحون﴾ هەموو لەناو ئەو بوونەوەرەدا مەلەوانی ئەکەن، بێ ئەوەی یەکیان لێك بدەن، ئەوە نیشانەی عەزەمەتی خوانیە؟ ئەوە نیشانەی عەزەمەتی بەو پەروەردگارەوو ئەو عەزیمەنیە؟ بۆ فکرناکەیتەوە؟ بۆ شەو ئەخەوی؟ دائیمەن فکرت لەدۆلارە، فکرت لەبازارێ دەبێ دۆلار هەڵئەستێ وەی ئەمرۆ نەم کڕی لەقیسم چوو، ئەی غەریب سەر لەسەر بالیف دانێ تەماشای گەورەیی خوا بکە واز لە دۆلار و دونیا بێنە بەسە بەس تەماشا سەرووت بکە سەر هەڵبڕە تەماشای دەستی پەروەردگارت بکە، تەماشای نەقشی خودای گەورەت بکە، ئەوە نەقشی خودایە، ئەوە دروست کراوی خودایە تەماشا چەندە جوانن چەند جوان لەئاسمان ئەبریقێتەوە ، بۆ خوای خۆت ناناسی بۆ لێی ناپاڕێیتەوە، بۆ وەناکەی خوای گەورە دڵت

منەوەر بكاو دڵێكی موطمئنت بداتێ، بەڕاستی ئینسان كەفكر لەو جوانەی ئاسمان ئەكاتەوە بەرۆژ تەماشای كە، ئاسمانێكی شین سبحان الله كە رەنگێكی جوانە وە(الله)ی ئەو ڕەنگە نەبایە دڵی ئینسانی ناخۆش ئەبوو دڵتەنگ ئەبوو ، باشە بۆ فكر ناكەنەوە ئەگەر ئەو ئەستێرانە لەئاسمان نەبان چەند نارێك و ناشرین دەبوو سبحان الله ئەگەر رەنگی شین نەبا ڕەش با خۆ دڵتان دەتەقی، تەماشای ئاسمانت بكردایە رەش بایە هەرشێت دەبووی، تەماشا خوای گەورە ڕەنگێكی وای دایتێ دڵت پێ بكرێتەوە غەمی دڵت لاببا، سبحان لله دیمەنی ئاسمان دیمەنێكی زۆر جوانە بۆ كەسێك كەوا فكری لێ دەكاتەوە، باشە بۆ فكر لەحەیوانات ناكەیتەوە تەماشا ئەو هەموو حەیواناتانە بكەن، تەماشای ژیانیان بكەین (امم امثالكم) خوای گەورە دەفەرموێ هەموو ئۆمەتن وەكو ئێوە، هەموو ئومەت ئومەتن (ولكن لاتفقهون تسبیحهم) ئێوە لەزمانیان حالی نابن، ئێوە لەتەسبیحات و زكرو وردی ئەوانە حالی نابن، هەموو زیكری خوا ئەكەن، هەمووی یادی خوا ئەكا هەمووی تەسبیحاتی خوا ئەكا؟ هەمووی حەمدو سەنای خوای ئەكا، سبحان الله بۆ رۆژێك لەرۆژان لەسەر شانەی مێروستانێك دانەنیشتی، شانە مێروو لەیەك تەماشا بكە بڵێ یاعظیم و یاكریم و یاقدیرو یا الله ئەوە چییە؟ ئەوە بۆ دانانیشن بۆ هەندە ئەجولێن ئەوە بۆ ئیسراحات ناكەن، نەخێر ئەمە ژیانیان یەك دەقەش ئیسراحاتی تێدا نیە، ئیش دەكا بەئێمەی تەمبەل ئەڵێ ئەی ئینسان تۆ تەمبەلی ئەتەوێ بەو تەمبەلیە بەهەشت ببەیتەوە ئەتەوێ بەو تەوەزەلیە بەخزمەت خوا بگەی ئەتەوێ بەو تەوەزەلیە بە بەهەشتی بەرین بگەی ناوە(الله) ئەبێ وەكو من بجولێی، حەرەكە بكەی دانەنیشی دائیمەن بجولێی لەخزمەت خوا بجولێی، لەخزمەت شەرعی خوا بجولێی نان بەحەلالی پەیدا بكەی دەی شەو نوێژو

قورئان بخوێنه پاش نوێژی بەیانیان مەخەوە بۆ ئەوەی بزانی تام و لەزەتی ناسینی خودا چەند خۆشە، بۆ ئەوەی خودا لوتفی لەگەڵ بکاو نورو بەرەکەتی خۆی لەدڵدا بدرەوشێنێتەوە، جا خۆشەویستانم ئەم مێروستانە چەند جوانن چ نیزامێکیان تێدایە دەگەنە یەك، بەلەحەزات یەك چرك چرك قسەیەکی پێکەوە دەکەن و دەڕۆن، دانانیشن وەکو ئێمە یەك سەعات گوفتوگۆی دونیا بکەن، مەجەلیان نیە ئەوانە ئیشیان هەیە.

ئێمە تەمبەلین ئێمە دادەنیشین لەمەجلیسان سێ سەعات و چوار سەعات، هەلیش دەستی دەڵێ زووە بۆ هەڵ دەستی تازە سەعات دوازدەیە کێوە دەچی، چوار سەعاتی عومری بەزایەع ڕۆی غەیری گوناهو غەیبەت و بوختان و درۆ هیچ چاکەی تیادا نەکرد، بەڵام مێروستان وەناکا مێروستان ئەزانی ڕۆژی قیامەتێ هەیە، ئەزانی زیندوو بوونەوە هەیە کاتێ خۆی وەکو من و تۆی تەمبەل بەفیڕۆ نادا جا کەسێك ئەمە حالی بێ وەکو من، چۆن ئەبێ بەخاوەن دڵی مطمئنة، بەڕاستی ژیانێکی عەجاییبیان تێدایە جا انشاء الله لەدەرسێکی تر ئەم باسەتان بۆ تەواو ئەکەم بەخوای گەورەتان ئەسپێرم.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

**خۆشەویستانم لەدەرسی رابردوو باسی دڵی مطمئنمان کرد، گوتمان دوو سیفەتی زۆر سەرەکی هەیە، سیفەتی یەکەم ئەوەیە کەهیچ شك وگومانی تێدانیە، ئەم دڵە یەقینێکی سەد لەسەدی هەیە، دووەم گوتمان ئەم دڵە سیفەتی وایە لەکاتی موسیبەت و غەم و پەژارە و فیتنە، هەرگیز سەخلەت و موشەوەش نابێ، خۆ نادۆڕێنی و ناشکوری ناکا، بەڵکو خۆی تەسمیلی قەزاو قەدەری رب العالمین ئەکاتن، هاتینە سەر خاڵی یەکەم، ئەبێ ئێمە فکر بکەینەوە دەرەجەی فکر کردنەوە گەڵێك زۆرە، بۆیە لەقورئان سبحان الله هەر پەرێك نەکەیتەوە ئیلا خوای گەورە روو لەئەقل ئەکا ﴿ لعلکم تتفکرون ﴾ و﴿ یا أولو النهي﴾ و ﴿ یا اولو الالباب﴾ ﴿ یااولو الابصار﴾ ئەوانە هەمووی لەگەڵ ئێمەیتی، بۆ ئەوەی ئەو مێشکە بەئیش بکەین فکر بکەینەوە لەگەورەیی خوا لە بوونەوەری خودای گەورە لەو شتانەی کە دروستی کردون، جا باسی هەندێکمان کرد هاتینە سەر مێروستان گوتمان بۆ فکر لەمێروستان نەکەینەوە لەرێك و پێکی و کارو کاسبی ئەم مێروستانە نەکەینەوە، جابەڕاستی کە مرۆڤ فکر دەکاتەوە دوو بەهەرمی ئەبێت :**

**یەکەم // هەیبەتێك و گەورەییەکی ئەو خوایەی دەکەوێتە دڵ.**

**دووەم // خۆشەویستیەك و مەحبەتێکی ئەو پەری ئەو خودایەی دەکەوێتە دڵی.**

ئـەوەش وای لێ دەكـات ئـەم دڵـە ببـێ بـەدڵێكی مطمـئن، سـعید لنورسـی (رەحمەتی خوای لێ بێ)

كاتێك كە لەمەنفا بوو ئەو ئیمامە بەڕێزە هەتا مـرد هـەر لـە مـەنفا دەژیـا، هـەزار رەحمـەتی خـوا لـەگۆڕی بـێ ئـەم ئیمامـە بـەڕێزە كاتێـك لەمـەنفا دەیویـست خانووێـك بـۆ خـۆی دروسـت بكـا، كـە قازمـەیان لـەزەوی دا دەگەیشتنە شارە مێرووستانێك، یەكسەر دەیگوت توخوا ئێـرە بـەجێ بهێڵن حەزناكەم ئەم دەوڵەتە رێك و پێكەیان لێ تێك بدەم بەڵام ئێمەش بەنـەفت دەیان سووتێنین ئیبادەیان دەكەین.

وەنـەبێ دابنیـشین فكـر كەینـەوە بـزانین ئـەم مێـروو سـتانە ئـەم مخلوقـە زەعیفە چەند ئیشێكی رێك و پێك دەكا، چەند جوان و قەشـەنگ مـن دوو نموونە دەهێنمەوە لەجوانی و رێك و پێكی ئەم مێرووستانە.

**یەكەم** // ئەگەر مەجموعەیەك لەشوێنێك گولەبەرۆژە بخۆن، میروستانەكان هـەموو پـەلكی گوڵەبـەرۆژە دەگۆزنـەوە نـاو كونـەكانیان ئایـا بـەفكری ئێـوە مێرووستان پەلكی گولەبەرۆژە دەخوا؟ نەخێر نایخوا، ئەی بۆ چیتی بزانـە، ئـەو هـەموو پەلكـە گوڵـە بـەرۆژە دەیـان باتـە نـاو خانووەكانیـان، خـانووی مێرووستانیش هەموو قان قات دروست كراوە دەرگاكانی لەڕاسـت یـەك نـین هەموو پەلكەكان لەژێرەوە رادەیەخن دوو سێ قاتی بن عاردی، هـەموو ئـەو پەلكە گوڵە بەرۆژەیە رادەیەخی وەك مافوری لەتەنیـشت یـەك كـەڕو هەیـە لـەناو زەوی ئـەو كـەڕوە پیـسایی دەكـا، پاش مـاوەی ئـەم كـەڕوە مێروستان دەیخوا لەبۆمیروستان (مواد غذائیة) بـۆ ئـەوەی ئـەم كـەڕوە ئـەو پیـساییەی لەگـەڵ خـۆل تێكـەڵاو نـەبێ، لەسـەر ئـەم گولـە بەرۆژانـە بكـاتن، ئـەوانیش بـەخاوێنی بیخـۆن هـیچ خـۆلی لەگـەڵ تێكـەڵاو نـەبێ، سـبحان الله چـەند خاوێنن ئەو پەلكە گولە بەرۆژانە وەكو سفرە رایدەخن.

**نموونــەی دووەم //** هـەر گـەنمێك كـە دەبـەن، سـبحان الله ئەوانـەی فـەلاحن دەزانن، ئەگەر مەجالیان بدەن بەخوا یـەك تـەن بەسـێ رۆژان هـەمووت بـۆ دەگۆزنەوە ژێر زەوی، باشە ئـەو هـەموو گەنمـە شـین نابێتـەوە، بـەڵێ گـەنم شین دەبێتەوە بگاتە ژێر زەوی دەڕوێتەوە، زەوی بەخۆی رووتوبـەتی هەیـە شین دەبێتەوە، نـاوە الله رۆژێـك نەمانـدی لەحەوشـەكەمان گـەنم شـین ببـێ لەبەرچی؟ لەبەر ئەوەی هەموو ئەم سەرو ئەوسەری گەنمەكـەی دەقـرتێنن، لێ ناگـەڕێ شــین بێتــەوە، یاســبحان الله ئــەی مێروســتان تــۆ خــەریجی چ مەدرەسەیەكی، پێم بلێ ئەم نیزامە لەكۆی فێر بـووی كـە گـەنم ئـەو سـەرو ئــەم ســەری نــەقرتێنی شــین دەبێتــەوە، ســبحان الله ئــەی ئەمــە دەلیلــی عەزەمەتی خودا نیە بـۆ فكـر ناكەینـەوە، بابـچینەلای شـتێكی تـر تەماشـای مـێش هـەنگوین بكـەین، ئـەومێش هەنگوینـە جوانـە چـەند كائیناتێـك و حەشەراتێكی جـوان و رێـك و پێكـە، ئـەو مـێش هەنگوینـە چـەند فكـری لێ بكەیتـەوە، گـەورەیی ئـەو خوایـەت بـۆ بـەدیار دەكـەوێ، دوو نموونـەتان بـۆ باس دەكەم :

**یەكەم //** سوندوقی شانەی مێش بكەوە، كونێكیان هەیـە لـەو كونـە دەچـنە ژووری لەپـشت كونەكـە راسـتەو خـۆ دوو مـێش راوەسـتاینە باشـە دەبـێ بـۆ راوەستابن، بەفكری ئێوە چیە؟ بافكربكەینـەوە یـەكێكیان دكتـۆرە وەئـەوی تر پاسەوانە، دكتۆرەكە ئیشی چیەو حەرەسـەكە ئیـشی چیە، ئـەو دكتـۆرە كولیەی طبی تەواو نەكردیە، بەڵام لەلای خۆیـان پـێ دەڵێن دكتـۆر، كاتێـك مێشێك لەدەرەوە دێتە ژووری هەردوو دەستەكانی و دەمی پڕ شیلەیە پڕی كردیـە دێتـە ژووری دكتورەكـە دەبـێ فەحـسی بكـا نـەوەكو خوانـە خواسـتە مادەیەكی خراپی هێنا بێ، مادەیـەكی ژەهـراوی هێنـابی ڤایرۆسـێكی لەگـەڵ خۆ نـەقل كردبێ یەكسەر لەناو ئەو هەنگوینەی بكاتن، هەر هـەمووی پـیس

بکاو هەنگوینەکە تێك بداتن، کەزانی خاوێن و پاکە ئینجا لێ دەگەرێ بێتە ژووری، سبحان الله ئەو هەنگوینەی ئەتۆ دەیخۆی هەرئاگاشت لێ نیە ئەو مێش هەنگوینە چەند پێ ماندوو بووە، مێشی دووەم ئیشی چیە زانیم دکتۆر ئیشی فحس کردنە ئەدی حەرەسەکە ئیشی چیە، پاسەوانەکەش مێش هەنگوینەکە بۆن دەکا، دەڵی بزانم لەجەماعتی خۆمانە هەر مەجموعە مێشێك بۆنێکیان هەیە.

سبحان الله مەلایین مێش هەیە، هەر مەجموعەی بۆ نێکیان لێ دێ حەرەسەکە بۆنیان دەکا، ئەگەر جەماعەتی خۆی نەبێ دەریان دەکات ئەگەر نەچێتە دەرێ هەردوو باڵی لێ دەکاتەوە، فرێی دەداتە دەرێ، بەڵام کاتێك لێ دەگەرێ بێتە ژوورێ دەزانی چ وەختێك ئەو کاتەی دەرەوە سەرماو باران و بابێت، ئەگەر باو و باران بێ ئەویش بێگانە بێ هاتبێتە ژوورێ رێ دەدەن بۆ؟ چونکە حەقی مێوان داری هەیە، با ئەو بارەی خۆی بێنتە ژوورێ لێی خەسار نەبێ لەدەرەوە بانەیکوژێ، سەرما رەقی نەکاتەوە، باو باران نەما ئەو جا ئەو مێشە دەچێتە ئەو خانەی کەلێی هاتیە، یاسبحان الله ئەو کەرەم و پیاوەتیەی لەکۆی فێر بووە؟ ئەوە هەموو خوای گەورە فێری کردوون، ئەگەر مشکێك یان حەیوانێکی گەورە خۆی بکاتە ناو شانەکەی یان سوندوقەکەی هەموو مێشەکان کۆدەبنەوە، مشکەکەیان پێ هەلناگیری چی لێ بکەن یەك مەجموعەیان دێت پێوەی دەدەن، کە پێوەیان وەدا یەکسەر دەمری باشە ئەوە کوشتیان ئەی بۆگەن نابێ، هەموو هەنگوینکەش بۆ گەن دەکا سبحان الله کابرای مێشەوان کە سوندقەکە دەکاتەوە، دەبینی تۆپێکی گەورە لەوسەری هەیە کە تەماشا دەکا، دەبینی مشکێکی گەورە مردووە، باشە کێ بەمێشەکانی گوت ئەی مێشینە وریا بن ئەوە مشکە بۆ گەنی دەبێ کە بۆگەنی بوو ومزعتان تێك دەدا ئەبێ دفنی بکەن بەشەمێ

نوقمی ناو شەمێی بکەن هەتا بۆ گەنی نەبێ، جاسبحان الله هەرچی باسی کەین لەو مێشە هەر کەمە، زۆرمان پێ یە بەلاَم بەسە باقی تر بۆ ئێوە بەجێ دەهێلم بۆ خۆتان فکری لێبکەنەوە دانیشن لەدیار ئەو مێشانە بلێن یا عظیم انت العظیم ئەوە چیە؟ دروست کردوە ﴿...رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١﴾ ال عمران/١٩١ ئەگەر ئێمە خاوەن عەقل بین، ئەگەر بیر بکەینەوە دەبێ ئاوا بین ئەگەر تەماشای هەر دیمەنێکت کرد لەو بوونەوەرە دەبێ سبحان الله بلێیێ الحمدلله بلێی ئەبێ پاك و مونەزەهی بنێری بۆ خودای گەورە باشە بۆ فکر لەنەبات نەکەیتەوە لەگژوگیاو دار نەکەینەوە، باشە تۆ ئەو هەموو گیایەت دیتوە چەند جوانە کاتێك ڕەنگی سەوزە چەند دلْت خۆش دەبێ باشە ئەگەر ڕەنگی ئەو گیایە سور بوایە هەر دەفەوتاین، وە الله دلْت دەتەقی، باشە ئەگەر رەنگی ڕەش بایە یان قاوەیی یان پەمەیی بایە چەند ناخۆش دەبوو بەلاَم خوا وەی کردیە ئەو گیایە کەسك بێ بۆ ئەوەی دلْت خۆش بێ دلْت بکرێتەوە، ڕەنگی سەوز سێ سیفەتی هەیە ١) غەم لادەبات و ٢) دلْخۆشیش دەهێنێت و ٣) چاو بەقوەت دەکات، جا من یەك شت دەلْێم تەماشای ئەو دارەی کە لەباخچەکە مان هەیە، دار گوێزە و دار هەرمیە ودار هەنارە و دار پرتقالە و دار خۆخە ئەوانە هەر هەموویان لەتەنیشت یەکن هەر هەموومیان بەیەك ئاو ئاو دەدرێن، هەموویان لەناو یەك خۆلْ دان هەموویان یەك کەس خزمەتیان دەکات هەریەکیان میوەیەك دەگری هەریەکە تامێکیان هەیە ئەوە چۆن دەبێ، بزانە ئەمە عەزمەتی خوای گەورەیە، ئەمەئیشی خوایە ئیشی کەس نیە، بۆنموونە کابرایەك باخچەیەکی هەناری هەیە ئەو هەنارە لەگەلْ ئەو هەنارە، دوو دارن

لەتەنیشت یەك ئەوە ترش ترشە ناخورێ ئەوەش شیرین شیرینە دەخورێ سبحان الله یەك ئاو یەك هەوا یەك خۆل ئەی ئەمە عەزەمەتی خوای گەورە نیە، باشە ئەم دارە چۆن دەگری، چۆن هەمووی دەبێتە میوەجات چۆن شیرین دەبێ چۆن بەتام دەبێ، ئێمە نازانین ئەوە هەموو ئیشی ئەم خودایە، وەرە بافكر لەخۆمان بكەینەوە لەدارو بەرد بگەڕێین، تەماشای خۆت بكە ﴿ وفي انفسكم افلا تبـــصرون﴾ خوای گەورە دەفەرموێ باشە هەست بەبوونی خۆتان ناكەن، بۆ فكر لەخۆتان ناكەنەوە ، بۆ تەماشای خۆت ناكەی ئەی ئینسان باشە چۆن دروست بوویت، چۆن دەژی چۆن ئەجولێتەوە یەك نموونە دەڵێم (لووت، گوێ ، چاو و دەم) هەر هەموویان تەرن هەریەكە ئاوێكیان تێدایە ئاوی دەم شیرینە، ئاوی لوت ترشە، ئاوی چاو سوێرە، ئاوی گوێ تاڵە، باشە ئەگەر ئەو ئاوانە بگۆڕابانە ئاوی دەم تاڵ بایە ئاوی لووت سوێر بایە ئاوی چاو تفت با ئاوی گوێش شیرین با، وەزعمان چی لێدەهات، یەكەمین شت ئەوەی حەشرات هەبوو، هەمووی دەچووە ناو گوێت، چونكە شیرینە ئەوە گوێت كەڕ دەبوو دەفەوتای، دەمیشت بەردەوام ناخۆش بوو چونكە هەست بەتاڵی دەكەی، دەبا هەر قەندە شەكر لەدوو یەك بخۆی وە الله چا هەر بەبەرنەدەكەوت قەندە شەكر خوا دەزانێ وەكو دۆلاری سعری بڵند دەبوو ، جا سبحان الله تەماشای خۆت بكە ، چاو ئەو چاوە ئەگەر ئەو ئاوە سوێرە نەبا چونكە ئەو ئاوە سوێرە تەعقیمە بەردەوام كرایتەوە تەعقیم دەكا، لێ ناگەڕێ توشی نەخۆشی بێت، وە لووتیش هەر بۆ خۆی دەزانی حیكمەتەكەی لەچییە دەزانی بۆ ترشە، جا ئەوە خۆشەویستانم كە فكرت كردەوە خوا ئەناسی كە خوات ناسی تەمەنای ئەكەی ئەچیتە پێش، رەجای لێ ئەكەی سوجدەی بۆ ئەبەی خوای گەورە دڵێكی مطمئنت، پێ دەبەخشێ، ئەتكاتە ساحێب دڵێكی مطمئن كە

ئـەم دڵـە گەیـشتە دەرەجـەی یـەقین لەناسـینی خـوداو لـە رۆژی قیامـەت و لەحەشرو حیساب و حالـەتی دووەم کـە لـە سـیفەتی دڵـی مطمئنـە ئـەویش ئەوەیە لەکاتی موسیبەت لـەکاتی بـەڵاو غـەم و پـەژارەدا تێـك ناچـێ لەبـەر چی؟ چونکە ئەم دڵە مطمئنة ئەزانی ئەم دونیایە دونیـای تاقیکردنەوەیـە، خوای گەورە ئەفەرموێ ﴿انا جعلنا ما على الارض زينة لها لنبلوهم ايهم احسن عملا﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ساحێبی دڵی مطمئن گوێی لێیـەو تەماشـای قورئان ئەکا کە خوای گەورە دەفـەرموێ ﴿ انـا جعلنـا مـا علـى الارض زينـة لهـا﴾ ئێمـە ئـەوەی لەسـەر زەوییـە زینـەت و جـوانی دونیایـە بـۆ چـی ﴿ لنبلوهم ايهم احسن عملا﴾ بەو زینەتەی دونیـا هـەموویان تـاقی بکەینـەوە بزانین کامیان کردەوەی باش دەکا، جا سـاحێبی دڵـی مطمـئن دەزانـێ ئـەوە ئیبتلایە، ئەو دونیایە ئەو غـەم و پەژارەیـە و فیتنەیـە هـەمووی ئیبتلایـە، جا سەبرو ئارامی دەگرێت خۆی مشەوش ناکات و سەبر و تحمل ئەکات.

خـوای گـەورە لەسـورەتی عەنکـەبوت لەسـەرەتای سـوورەتەکە دەفـەرموێ

أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ العنکبـــوت/٢-٣، خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێ ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ﴾ ئایا خـەلك واتێـدەگا بڵـێ لێمـان پـال داویتـەوە تـەواو ئیمانمان هێنا، ﴿وهم لايفتنون﴾ تاقیان ناکەینەوە ﴿ولقـد فتنـا الـذين مـن قبلـهم ﴾ ئومـەتانی پـێش ئێمـە هـەمووی تـاقی کردۆتـەوە فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ

ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَـٰذِبِينَ ﴿٣﴾ بۆ ئەوەی خاوەن دڵە ڕاست گۆیەکان لەگەڵ دڵە درۆزنەکان لێك جیابکەینەوە جا خۆشەویستانم ساحێبی ئەم دڵە دەزانێ دونیا جێی تاقیکردنەوەیە بۆیە مشەوەش نابێ، بۆیە خۆی نادۆڕێنی، ناشوکری ناکا هەتاله چاکەش بێ هەتا ئەو دونیاش رووی تێکرد دەولەمەند بوو، تەندروستی خۆش بو گەورە بوو ئەزانێ ئەوەش فیتنەیە.

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ونبلوكم بالخير والشر فتنة﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ئێمە تاقیتان دەکەینەوە چ بەخێر چ بەشەر، چ بەفەقیری چ بەدەوڵەمەندی، چ ساغی لەش چ بەنەخۆشی، ئێمە هەمووتان تاقی دەکەینەوە جاخۆشەویستانم ساحێبی ئەم دڵە مەوقیفی مەردانەی هەیە، جا دوو مەوقیفتان بۆ باس دەکەم: **مەوقیفی پیاوێك لەگەڵ ژنێك** لە ژیانی هاوەلەبەڕێزەکاندا مەوقیفی سوهەیبی رۆمی، ئەم پیاوە مەردە ئەم قوتابیەی پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەم شێرە سوارە خەڵکی شاری مەکە نەبوو، خەڵکی رۆم بوو هاتۆتە شاری مەکە، چیرۆکەکەی زۆر خۆشە سەروبردەی ژیانی ئەم هاوەلە زۆر خۆشە تکان لێ دەکەم بڕۆن بیخوێنەوە تاکو ئەم پیاوەتان بۆ بەدیار بکەوێ چ پیاوێکە، سوهەیبی رۆمی هاتە مەککە کەهاتە مەککە ئیمانی بە پێغەمبەر ﷺ هێنا دەستی بە ئیش کرد، دەولەمەند بوو پاشان هاوەلەکان هیجرەتیان کرد رۆیشتن سوهەیبیش وەکو باقی هاوەلەکان هەستا بە رێ کەوتو مەککەی لەبەر خوا و پێغەمبەری خوا بەجێ هێشت لەرێگا قورەیشیەکان رێیان لێ گرت، کافرەکانی قورەیش گوتیان بۆ کوێ ئەچی گوتی هیجرەت ئەکەم ئێوە بەجێ دەهێلم دەچمە مەدینە بۆ خۆم دەژیم گوتیان نەخێر تۆ ناڕۆی گوتی لەبەر چی، گوتیان

لەبەر ئەوەی تۆ ئەو هەموو سەروەت و سامانە لەگەڵ خۆت دەبەی هی ئێمەیە، کەتۆ هاتیە مەکە هیچت نەبوو، ئێستا ساحێبی ئەو هەموو مولك و ماڵەی ئێمە لێناگەڕێین تۆ بڕۆی دەبێ ماڵەکەت دابنێی، سوهەیب نەیکردە نامەردی گوتی باپێتان بلێم وە (الله)ی ئەگەر بکەنە عینادی و بکەنە رکابەری کەستان لەمن تیر ئەندازەتر نیە، لەهەمووتان جوانتر تیرداوێم وە الله چەند تیرم پێە دەیهاوێم هەتا دەتانکوژم ئەگەر پێشم تەواو نەبوو ئەوە دەست دەدەمە شمشێر هەتا تاقەتم هەبێ، شەڕتان لەگەڵ دەکەم، گوتیان ئەمە شەڕمان ناوێ ئەمە تەماحی ماڵەکەتمانە گوتی ئەگەر ماڵەکەمتان بدەمێ وازم لێ دێنن گوتیان بەڵێ گوتی هەموو ماڵەکەم ببەن بەتاقی تەنیا بەبێ یەك درهەمیش هەمووی بۆ بەجێ هێشتن، بەرەو پێغەمبەری خوا رۆیشت جا کە پێغەمبەر هەواڵەکەی بیست فەرمووی (ربح بیعك یا ابا یحیی) فەرمووی بەڕاستی کڕین و فرۆشتنەکەی تۆ لەگەڵ کافرەکان کردت بردتەوە ئەی باوکی یحیی، جا بەڕاستی ئەوە فیتنەیە سبحان الله دوو شت دێتە پێش، خواو پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ماڵی دونیا کامیان هەڵدەبژێری، لێرە خاوەنی دڵی مطمئن یەکسەر خواو پێغەمبەر هەڵدەبژێری تەواو سفر لە سەر دونیادا دەنێت چەند جاران خواو پێغەمبەر و پارە بەرامبەر یەك بوون دەستمان بەپارەکە گرت وەمان زانی لەبرسان دەمرین نەمان زانی ساحێبی ئەو پارە هەر (الله)یە، خاوەنی ئەو بوونەوەرە هەر (الله)یە، هەر (الله) دەتداتێ هەر ئەویش لێت دەستێنێتەوە، خۆشەویستانم مەوقیفی دووەم: **ئەم ئافرەتە بەڕێزەیە** کاتێك کە لەشەڕی ئوحد موسلمانان گەڕانەوە حەفتالە هاوەلە بەرزو بەڕێزەکان شەهید بوون وەزعێکی زۆر ناخۆش بوو هاوەلێکی زۆر بریندار ببوون، ئەم ئافرەتە ئازادەش ئەنصاری خەڵکی شاری مەدینە بوو لەسەر رێگای موسلمانان

ڕاوەستــا بــوو واموســلمانان دێنــەوە پێغەمبــەر ی خــواش ﷺ عادەتــەن لــەئاخیری دەڕوا، نــەوەکو خوانەخواســتە هاوەڵێــك لەســەر ئەســپەکەی بەربێتــەوە نــەوەکو برینــدارێك دڵــی لەخۆببێتــەوە بــەو دەســتە نازدارانــەی لەباوشی بنێ، بۆ خۆی بیهێنێتەوە شاری مەدینە ئەو ئافرەتـە ڕاوەسـتا بـوو پرسی ئەری کوا مێردم گوتیـان شـەهید بـوو، تـۆزێکی تـر پرسـی ئـەدی کـوا باوکم؟ گوتیان شەهید بوو کـەمێکی تـر پرسـی گـوتی کـوا کوڕەکـەم گوتیـان شـەهید بـوو، تـۆزێکی تـر مـاوە پرسـی ئـەدی کـوا براکـەم گوتیـان ئـەویش شەهید بوو گوتی باشە ئەی کوا پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان پێغەمبەر ساغ و سەلامەتە لەدوای جەیـشەکەوەیە نەڕۆیـشت لـەخۆی نـەدا نـەیکردە هـەرا، ســاحێبی دڵــی مطمــئن زۆر بەجەرگــە ڕاوەســتا، تــاکو نــوورو جــەمالی پێغەمبەرﷺ بەدیار کەوت تاکو ئـەو ڕیـشە موبارەکـەی بـەدیار کـەوت تـاکو ئەو چاوەگەش و جوانانەی بەدیار کەوت بەقوربانی هەردوو چاوەکانت بم ، کەبـەدیار کـەوت فـەرمووی مـادام تـۆ سـەلامەتی (کل مـصيبة بعـدك جلـل) هەموو موسیبەتێك پاش سەلامەتی تۆ هیچ نیە، ئـەوە مـەوقیفی سـاحێبی دڵـی مطمئنــە، فیتنــە گــەورەترین تاقیکردنــەوەو تەجروبەیــە بــاوك، بــرا، مێرد، کوڕ هەر چواری شەهید بێ فرمێسکت لەچاو نێتە خوار مەردی خـوا ئینتزاری محمد المصطفى بکەی ﷺ حا خۆزگە ئێمە ئەو ها باین و خۆزگە لەکاتی موسـیبەت و بـەلا مـەردباین، سبحان الله گلـەیم زۆرە لـە خوشـکانی بەڕێزم کە موسیبەتەکیان دەکەوتە سەری چ لەخۆ دەکەن چۆن خودا لـەبیر دەکەن چۆن پێغەمبەر لەبیر دەکەن، چۆن لەگـەڵ شـەیتان دەبنـە دۆسـت و هــاوەڵ لــەخۆ دەدەن، بۆیــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ لەعنــەتی لــەو کەســەی کردووە (من ضـرب الخـدود وشـق الجيـوب) کەسـێك لەرووەمـەتی خـۆی بـداو

کراسی خۆی بدڕێنی لە ئێمە نیە، هەموو وادەکەین وە (الله) پیاوەکانیشمان وا ئەکەن.

جا خۆشەویستانم ئێمە موسلمانین، ساحێبی دڵی مطمئن ئەبێ بەجەرگ بێ، ئەڵێین بگرین، بازۆر فرمێسك بێتە خوارێ چونکە پێغەمبەر بۆ خۆی گریاوە، کەئیبراهیمی کوڕی مردووە، بەڵام موهیم ئەوەیە ئەتۆ بە جەرگ بی قسەیەکی وا نەکەی خواو پێغەمبەر ﷺ پێیان ناخۆش بی، جا خۆشەویستانم ئەوەیە مەوقیفی موسلمانان و دڵی مطمئن، لەکاتێك دا کە توشی بەڵاو موسیبەت و غەم و پەژارە دەبێ باهەوڵ بدەین باهیمەت بکەین ئەو دووشتە دلی مطمئن بەدەست بێنن یەکەم : زۆر فکر کردنەوە لەگەورەیی خودا لەبوونەوەر تاخۆشەویستی خوامان لەلا دروست بێ تاسام و هەیبەتی خوامان لەلا دروست بێ، چونکە سام و هەیبەت وەت لێ ئەکات دائیمەن بپارێێتەوە، خۆش ویستنی خوا وەت لێ ئەکا بەردەوام بەرەو پیلی بچن وتاعەتی بکەی عیبادەتی بکەی خۆشەویستانم سەبر گرتنمان لەکاتی موسیبەت و نارامیمان لەکاتی غەم و پەژارەدا، بەڕاستی ئەم دوو سیفەتەوەمان لێ دەکات ببین بەساحێبی دڵی مطمئن، یارەبی خودایە لەبۆ خاتری ناوە بەرزو پیرۆزەکانت، دڵی مطمئنمان بەقسمەت بکەی، خودایە یەقینمان پێ ببەخشی، خوایە لەکاتی غەم و پەژارەو موسیبەت دا رزگارمان بکەی، تاکو دەرسێکی تر بەخوای گەورەتان ئەسپێرم..

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

**خۆشەویستانم پێخۆشحالم لە دەرسی حەوتەم، لەزنجیرەی باسی گەشتێك بەناو ناخی مرۆڤەکاندا، بەئێوەی خۆشەویست دەگەمەوە، بەئومێدی ئەوەی بتوانین بەهەموو لایەکمان سەفەرێك بەناو ناخی خۆمان دابکەین و باش لێی وردببنەوە، پاش ئەوەی کە زانیمان عیلەتەکە لەکوێیە وەلەکوێش ڕەش بووە و پیس بووە تابتوانین چارەسەری بکەین، بۆ ئەوەی خوای گەورە دڵی من و ئێوە بەنووری خۆی سپی کا وەهەروەها لەرۆژی قیامەتدا بەخزمەت پێغەمبەرو هاوەڵان و یاران و خوای جل جلالە ئەگەین انشاء الله، خۆشەویستانم لەدەرسی پێشوو باسمان کرد گوتمان دڵەکان دەبن بە دوو بەش دڵە سپیەکان و دڵە رەشەکان دڵە سپیەکان چەند جۆرێکن، بەجۆری قوەتی ئیمانی و قوەتی تاعەتی و قوەتی برواو یەقینی بەخوداو رۆژی قیامەت و بەزیندوو بوونەوەو بەحەشرو حیساب ئەم دڵانە هەیانە زۆر زۆر سپیە، هەیە لەو کەمتر هەیە لەوی زیاتر جا لەهەموویان بەقوەتترو منەوەرترو بەشوعاعترو بەبەرەکەتتر وە لەخوا نێزیك تر، دڵی مطمئنە بوو پاش ئەو دڵی سەلیمە دێت، دڵی سەلیم خوای گەورە لە قورئان باسی ئەکات دەفەرموێ** يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴿٨٩﴾ **(الشعراء/٨٨-٨٩)، واتە: رۆژی قیامەتێ کەسێك ماڵ ومنداڵی ئیستفادەی لێ ناکا ئیلا ئەگەر هاتوو بەدڵێکی سپی بەدڵێکی بێ**

غـەش بـەدڵێکی پـاك و بـێ گـەرد بەخزمـەت رب العـالمین دەگـات، جـا خۆشەویستانم دڵی سەلیم ئەو دلەیە کە خالیە و پاکە لـە بـوغزو عـەداوەت و حقد و ڕق لێبوونەوەو کبرو شتی پیس و خـراپ، دڵی سـەلیم ئـەو دڵەیـە کـە لـەخوا ئەترسـێ ئیخلاصی تێدایـە، جـاری یەکـەمیان ئـەو دڵـە سپیەیە دڵێکە سەلامەتە لەهەموو بوغزو عـەداوەتێك، ئیمـام احمـد کـوری حەنبـەل لەمەسنەدەکەی خۆی ریوایەت دەکا دەفـەرمووێتن، پێغەمبـەر ﷺ لەنوێـژی عیـشایێ پـێش ئـەوەی دەسـت بەنوێـژ بکـات فـەرمووی ئێـستا کەسـێکتان لێ بـەدیار دەکـەوێ ئـەهلی بەهەشـتە عبـدالله کـوری عومـەر دەفـەرموێ ئێمـە هەمووومان تاقیبمان کرد دەبێ کێ ئەهلی بەهەشت بێ، دیتمان پیاوێك هاتە مزگەوت ردێنێکی جوانی پێوە بوو، تازە دەست نوێـژی شوشـت بـوو، دەسـت بەریشی خۆی دادەهێنا تـك تـك ئـاوی دەسـت نوێژەکـەی بـەردەبۆوە لەگـەڵ دەستەکانی و بەدەستەکەی تریشی پێلاوەکـانی هـەلگرتبوو هاتـە مزگـەوتێ، هەمووومان زەینمان دایێ گوتمان ئەومیە گوتی رۆژی دووەم و رۆژی سێ یـەم هـەر پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی ئێـستاکە پیاوێـك دێتـە مزگـەوت ئـەهلی بەهەشـتە ئـەم هاوەلەبـەڕێزە دەفـەرمووێ نەفـسی پیاوەکـەی دوێنـی بـوو، عبدالله ی کوڕی عومەر ئەڵێ من بەدوای کەوتم پاش ئەوەی نوێژ تەواو بوو من بەدوای کەوتم، لـەڕێگا سـەلامم لێ کـردو گـوتم کاکـە مـن موشـکیلەیەکم لەگەڵ باوکم پەیدابووە سوێندم خواردوە سێ رۆژان نەچمەوە مـاڵی ئەگـەر روخسەت هەیە ئـەو سێ رۆژە قبـولم بکـەی ببـم بـەمیوان لـەلای جـەنابت، گوتی چ مانعەتم نیە، گوتی فەرموو چوینەوە مـاڵی ئـەوەی خوابەقسمەتی کرد شـتێکمان خـوارد، وەکـی ئێمـە نیـە هـەتا سـەعات دوازدەی شـەوێ هـەر لـەدیار سـەتەلایتی دانیـشی پـەنجا قـەناتی بکـە هـیچ ئیـستفادەی لێ نـەکا،

بەيانيش سەعات حەفتی بەيانی هەڵئەستێت و نوێژی بەيانيشی ڕۆيشتيە، عبدالله فەرمووی پاڵ كەوتين من نەنوستم تاقيبم كرد بزانم ئەم پياوە ئيشی چيە، كە پێغەمبەر ﷺ سێ ڕۆژان فەرمووی ئێستاكە پياوێكتان لێ بەديار ئەكەوێ ئەهلی بەهەشتە، گوتی دەبێ ئيشێكی زۆر گەورە بكا كە پێغەمبەر ﷺ مژدەی ئەداتێ لەدونيادا ئەهلی بەهەشتە پێغەمبەری خواش ﷺ قەت ئاوا بەكەسێك نالێ تۆ ئەهلی بەهەشتی مەگەر وەحی خوای گەورە دانەبەزێ ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ۝﴾ (النجم/٣ –٤)، جا فەرمووی شەوێ تەماشای كابرام كرد شەو نوێژيشی نەكرد بەس ديتم جار بەجار كەوە ئاگا ئەهات خۆی وەردەگێڕا دەی گوت ﴿ سبحان الله و الحمد لله ولا الە الا الله والله اكبر ولا حول ولاقوة الا بالله العلي العظيم ﴾ ئەم زيكرەی دووسێ جاران دەيگوت و دەنووستەوە، شەوێ دووسێ جار دەهات بەس ئەم زيكرەی دەكرد، بۆ سبەی چووم ئيشی خۆم كرد هەتا ئێوارێ هاتمەوە، شەوی دووەم لەلای بووم تاقيبم كرد نەفسی شت بوو ، شەوی سێيەم نەفسی شت، كەبەيانيەكەی داهات نوێژمان بەجەماعەت لەمزگەوتی پێغەمبەر ﷺ كرد ئينجا پێم گوت كاكە گيان باشتێكت پێ بلێم من لەباوكم تووڕە نەبووم هيچ موشكيلەشمان نەبووە بەڵام سێ ڕۆژان پێغەمبەر ﷺ دەربارەی تۆ فەرموو ئێستا پياوێكتان لێ بەديار ئەكەوێ ئەهلی بەهەشتە هەر سێ جاران تۆ دەرچووی منيش مەرەقم كرد بزانم تۆ چ كردەوەيەك دەكەی كە خوای گەورە ئەو فەزڵەی پێ بەخشی كە پێغەمبەر ی خوا ﷺ لەدونيايێ، مژدەی بداتێ بەجەنابت ئەهلی بەهەشتێی منيش تاقيبم كردی ، گوتی وە (الله)ی ئەوەی ديتت هەر

ئەوەندەیە هیچ شتێکی تر نیە، عبدالله فەرمووی: پێم سەیر بوو لەناودڵی خومدا گوتم باشە هەر ئەوەندە، شەو نوێژی نەبوو تەنها نوێژەکانی بەجەماعەت دەکرد.

غەیبەتی کەسی نەدەکرد قسەو باسی کەسی نەدەکرد، ئەگەر ئاوابێ وەکو خۆمان گوتی لەوی بەدین ترین، باشە ئەوەچی کردیە پێغەمبەر ﷺ ئەو مژدەی بداتێ هەر لەخەیاڵ دابووم بەجێم هێشت گوتی فلان مەرۆ ڕاوەستە شتێك هەیە گوتم چیە، گوتی من خوای گەورە دڵێکی پێ بەخشیوم قەت حەسادەتی بەکەس نابەم، بەرامبەر ئەو نیعمەتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوەو ڕقم لە کەس نابێتەوە گوتم ئەوەیە کەس پێی ناکرێ ئەو دڵەی وەکو تۆی هەبێ خۆشەویستانم دڵێکی سەلیم لەهەموو بوغزو عەداوەتێك بەرامبەر خەڵکی ئێمە دڵمان پڕ بوغزو عەداوەتە بەرامبەر یەك، ئاخ تەماشا فلان خەنی بوو ، بەتالانی ماڵی خەڵك، حەسودی بەئاگری دەبا ماڵی خۆی کاول کردیە، ئەم دڵە چۆن سەلیم ئەبێ، ئەم دڵە چۆن بەرەکەت و نوری خوای بەر ئەکەوێ، پڕ بوغزە پڕ عەداوەتە پڕی ڕق لێ بوونەوەیە پڕی تورەبوونە جا ئەو دڵە پڕ ببێ بە ئەخلاقێکی شەیتانی پڕ ببێ لەهێلکەی شەیتانی چۆن نوری ئەو خوایەی تێدا جێ ئەبێتەوە کە دڵی هەر خەریکی غەیب و کەم تەر خەمی خەڵکی تێدایە .

چۆن تام و لەزەتی لەنوێژەکانت ئەکەی، چۆن تام و لەزەت لەموناجاتی خوا ئەکەی هەموو بێ بەشین لێی ئەوە سیفەتی دڵی سەلیم بوو، **یەکەم سیفەتی** ئەوەیە خالیە لەهەموو بوغزو عەداوەتێك، هەرگیز هیچ بوغزو عەداوەتی تێدا نیە، هەتا جارێکیان پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو لەناو هاوەلە بەرێزەکان باسی صەدەقەی دەکرد باسی گەورەیی خێرو خێراتی دەکرد

فەرمووی ﴿ المؤمن تحت ظل صدقته يوم القيامة ﴾ فەرمووی ئیمانـدار لـەرۆژی قیامــەت لـەبن سـێبەری خێرەکەیـەتی، چـونکە رۆژی قیامــەتێ، کۆمەلـە خـەلکێك سـێبەریان یـاخود هـەوریان لەسـەر سـەریە، ئـەم هـەورە لێناگەڕێ خۆر کاریگەری لەسەر سەرمان هەبێ ،چونکە لەقیامـەتێ رۆژ زۆر نزیك ئەبێتەوە، یەك میل دەمینێ، لە ٩٣ ملیۆن میل کە لەزەوی دوورە.

دەبێ ئەم خەلکە چ وەزعێکیـان بەسـەر دابـێ بۆیـە خـەلك هەیـە هـەتا نـاو دەمی لەئارەقەی خۆیدایە خوای گەورە پەنامان بدا هەندێك کەس سێبەری لەسـەر سـەریە جایـەك لـەو سـێبەرانە صـدقەیە سـێبەرێکی تـر سـورەتی (البقرة وال عمران)ە هەر کەسێك ئەم دوو سورەتە لەبەر بکا خـوای گـەورە لـەرۆژی قیامـەتێ دەیکاتـە چـەتر لەسـەر سـەری، لێناگـەڕێ تیـشکی خـۆر بەسـەر سـەری بکـەوێ ئارەقـەی بکـا جایـەك لـەو چـەترانە لەسـەر سـەرتن صدقەیە، جـا پێغەمبـەر ﷺ زۆر مـەدحی خێـری کـرد، هاوەلێـك هەسـتاوە، فەقیری دەست کورتی هەژار با بـزانن هـەژارو نـەدارو کەساسـەکان ئەوانـەی نیتیان بزانن پێغەمبەر ی خوا ﷺ چۆن و چی بۆ داناون هەستاوە گوتی یـا رسول الله بە دایك و باوکەوە بەقوربانت بم، من نیمە هیچ بکەمە خێر مـن شتێکم نیە بیبەخشم، ئەو خێرە بەقسمەتم بێ بەلام یەك شتم هەیە گوتی چیە فـەرمووی هـەموو رۆژێ کەدەچـمە سـەر جێگـا سـەر لەسـەر سـەرین دادەنێم دەلێم خوایە گەردمنی هەموو ئەو خەلکە ئازا بێ کە غەیبەتم ئەکا کـە بوختـانم بـۆ هەلئەبەسـتن، ئەوانـەی باسـم ئەکـەن، ئەوانـەی لەعـەرزو ناموسم قسەئەکەن ئەوانەی هەر قسەیەك ئەکەن، خوایە گەردمنیان ئـازابێ لـەناو دلـی خۆمـدا بـوغزو عـەداوەتی هـەموو فـرێ ئـەدەم ئینجـا دەخـەوم، فـەرمووی ئـەوە سـەدەقەم هەیـە هیـچی تـرم نیـە دانیـشتەوە بۆیـە بـەیانی

پێغەمبــەری خــوا ﷺ فــەرمووی کــوا فــلان وتیــان؟ یارســول الله ئەوەتــە، فــەرمووی بــانگی بکــەن هاتــە پــێش گــوتی لەخزمــەتت دام، پێغەمبــەریش فــەرمووی وە الله ئیمــشەو خــوای گــەورە ئــەو ســەدەقەی تــۆی قبــول کــرد سەدەقەیەکی بــێ پــارە بــەڵام مــەردی ئــەوێ مــەرد ئــەو دڵــەی خــۆی ئــەوەی بوغزو عەداوەتی و پیسی خۆی هەموو فڕێ بدا، ئێمە خــەومان لێ دەتــۆرێ، لەبەر رقی خەڵکی چەند سەعات لەبەر بــوغزو عــەداوەتی کرمــی نــاو دڵــی خۆمــان خــەومان لێ دەروا شــەو هــەتا بــەیانی خــەومان لێ ناکــەوێ رقمــان لەکەسێکە چونکە کەیفمان پێ نایــەت چــونکە دەوڵەمەنــد بــێ هــەبوون بــێ ناودار بــێ گەورە بــێ هــەرگیز حــەزی لێ ناکــەی حــەز دەکــەی بــەزەلیلی بــە شکەستی بەفەوتاوی ببینی بۆیە دڵی پاك خوای گەورە ئەیەوێ ئەم جــۆرە دڵانە خوا بەرزیان ئەکاتەوە، **سیفەتی دووەم** ئەم دڵەیە کە خــوای گــەورە بــۆ خـــــۆی دەفـــــەرموێ ﴿يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ٨٨ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ٨٩﴾ الـــشعراء/٨٨-٨٩، واتــە کــە ســێك ئــەم دڵــەی پاراســت لەئافاتی ماڵ و منداڵ و دوو ئافاتی زۆر گەورەن، خوای گەورە بــۆ خــۆی بــە دوژمــن نــاوی بردوونــە ﴿ ان من اولادكم واموالكم عدولكم﴾ خــوای گــەورە دەفەرموێ فیتنە هەیە لەماڵ و منداڵی خۆی، هەیە لەوسەروەت و سامانەی هەیەتی وەلەو خێزانەی هەیتی دەبێتە فیتنــە و دوژمنــی ئــەو ئینــسانە جا خۆشەویستانم کەسێك لەئافاتی مال رزگای ئەبێ کاتێــك ئــەو ماڵــە نەچۆوە نــاو هــەناوی ئــەو ئینــسانە، دڵێکــی ســەلیمی پــێ ئەبەخــشێ بــەڵام کــوا کــەم لەئێمە هــەن دەخیلــەی پــارەی لــەناو دڵــی دانــەکوتابێ، ئێمــە پارەمــان لــەناو گیرفانی نیە، هەموو پارەکە لــەناو دڵمانــە، بۆیــە کاتێــك ئەمانــەوێ خێرێــك

بکەین زۆر زەحمەتە بۆ؟ چونکە دەبێ ئەم دڵە شەق بکەین ئینجا دە دینار دەربێنی بکەیە خێر بەڵام کەسێك ئەگەر پارەکەی ناو گیرفانی بوو یەکسەر بەکردنەوەی گیرفانەکەی دەتوانێ پارەکە دەربێنی لەناو دەستی هەزار بکا، ئافاتی ماڵ زۆر ئافاتێکی گەورەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ ( لکل أمةِ فتنة وفتنة امتي المال) بۆ هەموو ئومەتێك فتنەیەك هەبووە، فیتنەی بەنی ئیسرائیل لەژنان بوو، فیتنەی ئومەتی محمد ﷺ دەفەرموێ لەپارەیە لەپارەو پول و سەروەت سامانە ﴿ الا ما رحم ربي﴾ کەممان لەپارە ساخ دەردەچین، ئیلا شتێکی لێ پەیدا ئەبێ، غەشێك خیانەتێك ناپاکیەك پیسیەکی لێ پەیدا دەبێت جا سبحان الله ئافاتی مال وا لەپیاو دەکا زەلیل و رەزیلی دەکاتن وای لێ دەکاتن فکر نەکاتەوە پارە لە حەلالی کۆ دەکاتەوە یان لەحەرام، مروئەت و شەهەماتی دەبا بەلکو حەیاو شەرمیش دەباتن، جاخۆشەویستانم ئێمەی موسلمانان زۆر کات خوای گەورە ئاورێکمان لێ ئەداتەوە تۆزێك هەست بەماڵ ئەکەین پارەو سەروەتێك و سامانێکی پەیدا ئەکەین، چەند زوو مەغرور ئەبین بڕوابکەن جارێ زوو سەلام لەخەڵك ناکەین.

خەڵك بەکەم دەزانین، فەقیرێك پێمان بڵێ مەرحەبا، وادەزانین داوای پارەمان لێ ئەکا، ئەسلەن حەز بەمەجلیسی فەقیران ناکەین، لەبەر ئەوەی فەقیرە پارەی نیە، حەز لەمەجلیسی ئەکەم حەز دەکەم هەر لەگەڵ دەولەمەندان دانیشم، نانی دەولەمەندان بخۆم بەلام فەقیرێك بڵێ توخوا کاکە حەز دەکەم لەماڵی من نانی بخۆی هەزارو سەد عوزی بۆ دەهێنێتەوە، نانی ناخۆی لەبەر هیچت نیە بەلام نەفست قبول ناکا ئافاتی ماڵ ئەتۆی کوشتوە دڵی مراندوە نایەڵی لەگەڵ ئەو فەقیرە جارێك دانیشی نان بخۆی،

بۆیه جارێکیان فەقیرێك هاته خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، سەلامی کرد، فەراغێك هەبوو لەبەینی دوو هاوەڵان دانیشت، هاوەلێکی دەوڵەمەند لەوێ دانیشتبوو، کەهاوەله فەقیرەکە هات هاوەڵە دەوڵەمەندەکە یەکسەر خۆی کۆ دەکاتەوە، هەژارەکە دانیشت زۆر قەلبی پێ تێك چوو که نەیهێشت لەشی بە شمەکی ئەو پیاوە فەقیرە بکەوێ، کە ڕەنگی تێك چوو دەولەمەندەکە هەستی پێ کرد کەشتەکی کرد بەدڵی داهات یەکسەر هەستاوە گووتی: یارسول الله عەفوم بکە پێغەمبەر ﷺ پێی گوت بۆ نەتهێشت شمەکت بە شمەکی بکەوێ وات ئەزانی کەخۆت لێ خشاند دەولەمەندیەکەی تۆ دەچێتە لای وی، یان فەقیریەکەی وی دێتە لای تۆ، یەکسەر هەستاوە گوتی تۆ بەم کرد و نیوەی ماڵم بەخشی بەو فەقیرە نیوەی ماڵی خۆم کەفارەتی ئەو تەکەبوورەی کەهەم بوو، دامە ئەو کابرایەی، فەقیرەکە هەستاوە گوتی: (لایارسول الله) نا ئەی پێغەمبەری خوا نا مەوێ گوتی بۆناتەوێ؟ گوتی نەوەکو منیش وەکو ئەو کابرایە مەغرور بم کەیفم بەفەقیرنێ، خۆشەویستانم وە الله کەسێك ئافاتی ماڵ لەدڵیدا زۆر خەتەره مەغرور دەبی بەتۆزە ئاوێك مەغرور دەبی بەکەمێك پارە مەغرور دەبی، بەڕاستی ماڵ ئی ئەوەی نیە پێی مەغرور بی هەزار رەحمەت لەپێشینان کە گوتیتیان ماڵ چلکی دەستە، پیاو ساڵحێك هەبوو لەریاض، دادەنیشت خوا لێی خۆش بێ مردیە، ئەم پیاو سالحە لە مەوسیمی حەج چوار سەد پێنج سەد کەسی لەماڵی خۆی بەخێو دەکرد، مەسەرەفی دەکردن هەرسێ جەم خواردنی دەدانی، هەتا خەلکەکە لەحەج دەگەڕایەوە ئەوە ئیشی بوو هەموو ساڵێ، جا دیوەخانێکی زۆر دوورو درێژی هەبوو، کاتێ خۆی کوڵ هەلگر بووە پشتە کۆلەکەی لەدیوەخانەکەی لەدیواری دابوو چونکە وەختی خۆی

بەو پشتەکۆڵەی دەوڵەمەندببوو لەدیواری دابوو، چونکە ئەو کابرایە بە فەقیرو بەعەنباری و بەنان و ئارەقەی نێو چەوانی خۆی گەیشتیتێ، کابرا دەوڵەمەند بوو زۆر مەشهور بوو جا خەڵك کە دەچوون دەیان گووت مام حاجی گیان ئەوپشتە کۆلە چیە لەوێت داوە تەماشاکە سبحان الله کابرای ئێمە ئەگەر لەفەقیری دەوڵەمەندبێ شەرمێ دەکا پشتە کۆلەکەی خۆی لە دیوەخانێ بدا مەنزەرێك یان رسمێکی تاغوتەکی لێ دەدا، گوتی وە(الله) پێم خۆشە کەسێك بێتە ئێرە بزنێ من کورەفەقیر بووم بەخۆم پێرا گەیشتووم بۆیە فەخر بەو پشتە کۆلەی خۆم دەکەم توانی ئەو نەفسەی خۆی بشکێنێ و ئافەتی ماڵی نەکەوێتە دڵی وە (الله)ی شەرممان بەخۆیە بڵێین فەقیرین و رۆژێ لەرۆژان عەمبار  بوومە، نانێکی ساردم خواردیە، بەڵێ دڵی سەلیم سەلامەتە لە ئافاتی دووەم کە منداڵە، کابرای وا هەیە وا دەزانێ حەوت کوڕی بوو تەواو دونیا هەموو داگیر ئەکا بۆ خۆی تەواو کەیفی بەخۆ دێ، خاوەن حەوت کوڕم، وە (الله)ی ئەگەر ئەم کوڕانە تەربیەت نەدەی، ئەم کوڕانە لەسەر رێبازی محمد المصطفی ﷺ نەمرن، لەرۆژی قیامەتێ تۆ رائەگرن حیسابت لەگەڵ ئەکەن چەند پیاومان دی کوڕی گەورەشی هەبوو هەتا جاحێر بوو فەخری بەو کوڕانە ئەکرد کە نەخۆش کەوت لە لای زاوایان کەوت، کچەکەی بەخێوی کردو نانی منەتی زاوای دەخوارد کورەکان هەموو فرێیان دا، جا ئینسان هەرگیز هەڵ نەخەڵەتێ بەماڵ و منداڵی زۆر، بەڵکو بادوو کوڕت هەبێ سالح بن رێك و پێك لەسەر دەستان بەخێوت بکەن گەڵێك باشترە لەحەوت کوڕ کەهەر هەموویان هیچ بۆ خوا نەژیاو لەرۆژی قیامەتێ تۆ رابگرن، خوای گەورە پێت بفەرموێ وەرە کابرا من نازو نیعمەتی زۆرم پێ بەخشی، حەوت کوڕم پێ دای چیت لێ کردن، ئەم

کوڕانە فێرە قورئانت کردن، فێرە خزمەتی دێنت کردن، فێرن کەسابەتی حەلاڵت کردن یا فێرە ڕاو ڕووت و زەلام کوشتن و جەردەییت کردن، جا خۆشەویستانم ئەم دووئافاتە زۆر گەورەن ئەبێ زۆر خۆمان لێ بپارێزین، تاکو ئەم دلانەمان دڵێکی سەلیم بێ، **سیفەتی سێ یەم** ئەم دڵە ئەوەیە لەخوا ئەترسێ وا ئەزانێ مار پێی وەداوە چۆن جێگەیەك مار پێوەدا ئێشی هەیە ئەم دڵەش دائیمەن ئەجولێ و هاوار ئەکا لەترسی خودای گەورە، ئەم دڵە سەلیمە دڵێکە پاکە، واتە مخلصە خالصە لەغەیری ئەو خودایە، هیچیکەی تێدا نیە شاعیری کەرکوکی شێخ نجم الدین ناسراوە بەصابری ئەفەرموێت:

گەردەرروونی دڵ لەنەفسی ماسوی واخاڵی نەکەی

نەقشی الله لەو دڵە جێگیر نابێ ئەی جاهیدە

تۆ ئیجازەی زیکری بێ دەنگی لەماسی وەرگرە

قیرە قیری شەو وەکو قورباقا نادات فائیدە

خۆشەویستانم دڵی سەلیم هەموو ئیش و کارەکانی بۆ خوایە، لەبەر ئەوە سەلامەتە ریای تێدانیە کەیف هاتن و کبری تێدانیە، بچێتە مزگەوت قسەیەك بکا، هەموو ئیش و کارەکانی بۆ خوایە بۆ نموونە موسڵمانان دەچنە حەج و دێنەوە، هەموو خەڵك بڵێ خوا حەجت قەبول بکا، ئەگەر یەکێك دیار نەبێ فلان بۆ دیار نەبووی ئەدی لەحەجێ نەهاتبوومەوە تەماشا ئەوە نیشانەیە بۆ خوای نەبوو، ئەگەر بۆ خوای بایە ئینتزاری سوپاس و ستایشی خەڵکی نەدەکرد، دڵی ئێمە ئەگەر چاکەیەك بکا، یان یارمەتی هەژارێك بدەین یان حەز دەکەین بۆ خۆمان بۆ خەڵکی باس بکەین یان خەڵك هەموو بێتن بڵێن، یارەبی خوا خێرت بنوسێ ئیشێکی

مەردانەت کرد، کەواتە هیچم بۆ خوا نەکرد، ئەگەر دەتەوێ خوای گەورە لێت قبول بکا دەبێ ئەم دڵە بەس خوای تێدا بێ ئەگەر خوا لێم رازی بێ تەواو باکەسیش نەزانێ کەسیش ئاگای لێ نەبێ، خۆشەویستانم لەمێژووی فتوحاتی ئیسلامی جارێک موسڵمانان لەشوێنێك گیرببوون، هەرچەندە هجومیان بۆ کافرەکان ئەبرد نەدەبۆوە، رۆژێك سەرۆکەکەیان زۆر وەزعی تێك چوو شپرزە بوو هەستاو گوتی بەڕاستی موسڵمانان ئەوە حاڵ نیە ئێمە تیایداین، ئەمە چەند رۆژە لەژێر ئەو قەلایەین ناتوانین ئەم قەلایە بشکێنین چیتان لێ قەوماوە ئەی ئێمە چ بەخەلیفەی موسلمانان بڵێین، بڵێین غیرەتمان بەردا ورەمان بەزیوە.. ئێوە مەردی خوابن باشتێکی وابکەین بەیانی ئەم قەلایە بشکێنین دەرگای قەلایەکە بشکێنین بچینە ژووری سبحان الله بەیانی کابرایەکی مولەثەم بەس چاوی دیار بوو شەڕێکی زۆر مەردی کرد هەتا دەرگای قەلاکەی شکاند چووە ژووری موسلمانان لە دوای چوونە ژورێ فەتح بوو پاش فەتحەکە دوو رکعات نوێژی فەتحیان کرد قائیدەکە ئاوری داوە گوتی رەحمەت لەو کەسەی کە دەم و چاوی خۆی بەستا بوو کێ بوو خەڵاتی ئەکەم هیچ وەڵام نەبوو سبحان الله دەبێ کێ بێ ئەم کابرایە ئەم فەتحەو غیرەتەو خێرە گەورەی کرد بۆ خۆی بەدیار نایەخێ، هەرچەند هەوڵی دا نەیدۆزیەوە شەوێ لەناو خێمەکەی عاجز دانیشتبوو، کابرایەك هاتە لای گوتی قوربان، فەرمووی بەڵێ گوتی ئەگەر پێت بڵێم کابرای مولەثەمەکە ئەو فەتحەی بە قسمەت موسلمانان کرد کێ بوو، لەسەر دەستی ووی خودای ئەم فەتحەی هێنا پێت بڵێم، بەلام پەیمان بدە بەکەس نەڵێی، گوتی وەعد بێ، گوتی منم، فەرمووی تۆ کێی گوتی پەیوەندیت پێ نەبێ، ناوت چیە گوتی تەنها بۆ ئەوەی لەمەراقا نەبێ

ئەوەمنم خودا حافیز، تەواو لەو رۆژی بەدواوە کەس سەیرانی کێ ئەو خێرە گەورەیەی کردووە، بەڵام ئێمە باین دەچووینە سەر قەڵاتەکە دەمان گووت خەڵکینە من بووم ئەو هام کرد و ئەوهام کرد، خەڵك ئەیەوێ بۆ خوا کار بکات، ئەیەوێ خوا لێی قبول بکا، خوا لێی ڕازی بێ، بە دڵی سەلیم بە خزمەت خوای گەورە بگا خوا پێی بفەرمووێ ﴿ أدخلوها بسلام ذالك يوم الخلود﴾ فەرموو بەسەلامەتی برۆنە ژوورێ، کە دڵتان سەلیم بوو ئەمرۆ ئەبێ بەسەلامەتی بەبێ ئەزیەت و ئازار ئینسان تیادا ئەمێنێتەوە تیادا ژیان دەباتە سەر، جا خۆشەویستانم بائێمە خاوەنی ئەم دڵە سەلیمەیە بین وە (الله) دڵێك ئەم چوار سیفەتەی تێدابوو، دەبێتە دڵی سەلیم، کەدڵیش بوو بەسەلیم مژدە بۆخۆی، بەڕاستی شایستەیە کە نوری خودای تێدا جێگیر بێ و نزیك بێ لەخوا و تام و لەزەتی موناجاتی رب العالمین بچێژێ، ئەم چوارەش ئەمانەن :

یەکەم // ئافەتی حقد و حەسەدو بوغزو کبریای تێدا نەبێ.

دووەم // سەلامەت بێ لەفیتنەی ماڵ و منداڵ.

سێیەم// سوتاو بێ لە ترسی خوا.

چوارەم // خالصەن و موخلصەن هیچ شتێکی وای تێدا نەبێ کە ڕیابێ بۆ ئەوەی خەڵك مەدحی بکا، بەلکو هەموو ئیشەکانی تەنها لەبۆ رب العالمین بێت.

جا خۆشەویستانم تاکو دەرسێکی تر بەخزمەتتان ئەگەم لەدڵێکی تر خوای گەورە هەمووومان مۆفەق بکاو هەموومان بکاتە خاوەن دڵی سەلیم انشاء الله.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

خۆشەویستانم لەدرەسی هەشتەم، لەزنجیرە باسی گەشتێك بەناو ناخی مرۆڤەکان دابەخزمەت ئێوەی خۆشەویست دەگەمەوە، بەپشتیوانی خوای گەورە باسی دڵێکی تر دەکەین، سێ یەمە لەدڵە سپی یەکان ئەم دڵەش زۆر نزیکە لەخوا، دڵێکی زۆر بە قەدرو بەڕێزە، دڵێکە ساحێبەکەی لەلای خوای گەورە خۆشەویستە وەهەر کەسێك ئەم دڵەی هەبێت ئەوا کافیە بۆ خۆی، کە لەناو بەهەشتێ بەڕێزو قەدرو حورمەتێکی زۆری بگرن و وەجێ و شوێنێکی زۆر باشیشی پێ ببەخشن، ئەم دڵەش دڵی مونیبەیە ئەو دڵەی زوو پەشیمان ئەبێتەوە، ئەگەر گوناهێك بکا یان بەسەر گوناهێك دابچی، خۆشەویستانم یەك شتی زۆر موهیم هەیە حەز دەکەم پێش ئەوەی باسی دڵی مونیبەتان، بۆ بکەم ئەم شتەتان عەرز بکەم، هەرکاتێك تو گوناهێکت دیت دڵت پێ خۆش بوو، بزانە تۆ دڵت مردووە بەڵام کاتێك کەگوناهێکت دی دڵت پێ توندبوو بزانە دڵت زیندووە، ئەوە بکەنە قاعیدەو خۆتانی پی تاقی بکەنەوە، بۆ نموونە ئەگەر ئافرەتێکی رووتتان دی ئەگەر دڵت پێ خۆش بوو، تۆ دڵت مردووە، کاکە گیان..خوشکی بەڕێز م تۆ دڵت مردووە برۆ داوا لەخوا بکە دڵێکی ترت بداتێ، بەڵام ئەگەر دڵت پێ توندبوو، بزانە خوای گەورە دڵێکی زیندووی بەتۆ بەخشیوە، جا دڵی ئەو جارەمان دڵی مونیبەیە ئەو دڵە کاتێك گوناه ئەبینێ ئەلەرزێ، کاتێك مەعصیەت

ئەبینیٚ غەم ئەخوا کاتێك بیٚ ئەمریەکی خوا لەپێش چاوانی رووئەدا، زۆر ئەترسیٚ لەخوا، ئەم دڵە دلی خوای گەورە بۆ خۆی لەقورئانەکەی دا باسی کردووە دەرفەرمویٚ ﴿ وازلفت الجنة للمتقين غير بعيد هذا ماتوعدون لكل اواب حفيظ من خشي الرحمن بالغيب وجاء بقلب منيب ادخلوها بسلام ذلك يوم الخلود﴾ .

خوای گەورە دەفەرمویٚ ﴿ ازلفت الجنة للمتقين غير بعيد﴾ ئێستا بەهەشت لەبۆ موتەقیان رازایتەوە، دەرازێنێتەوە رۆژ بەرۆژ خوای گەورە ئەمریان پیٚ دەکا جوان بن، حۆریە چاو کالە چاو گەشەکان خشلی خۆتان هەموو لەبەر بکەن و مال و حاڵی خۆتان هەموو جوان بکەن، مەلائیکەتەکان رۆژ بەرۆژ دارەکان جوانترو پوختترنیشان بدەن، بەبەهەشت بڵێن با جوان خۆ برازێنێتەوە ﴿ للمتقين غير بعيد﴾ لەبۆ موتەقیان ئەم بەهەشتە نزیکە هەندەی نەماوە پیٚ شاد بن ﴿ هذا ما توعدون لكل اواب حفيظ﴾ ئەوەیە خوای گەورە وەعدو موژدە دەداتە موتەقیان بۆ کیٚ ﴿لكل اواب حفيظ﴾ کە سێك زوو تۆبە بکاو زوو بگەرێتەوە لای خوای گەورە و خۆی بپارێزی لەگوناهـ لەنەزەر لەدرۆ، لەغەیبەت، لە بوختان لەزولم لەحەرام خواردن، مال و منداڵی خۆی لەبەرەلایی و لەشتی ناشرین بپارێزی ئەو بەهەشتە وەعدی بەو کەسانە داوە، کە سیفەتێکی تری ئەم بەهەشتەیان بەقسمەت ئەبیٚ ﴿ من خشى الرحمن بالغيب﴾ کەسێك لەپەنهانی داکەس ئاگای لیٚ نەبیٚ لەخوا بترسیٚ، نەك لەشەرمی خەڵك نەك لەبەر رووی خەلك نەك لەبەر ریای خەلك، هەتا پێی بڵێن لەخوا ترسە، بەڵکو لەترسی خوا ﴿من خشى الرحمن بالغيب﴾ لەخوا ئەترسیٚ کەسیشی لانەبیٚ، هەر لەخوا ئەترسیٚ

﴿وجاء بقلب منيب﴾ دڵێکی مونیبی هەیە دڵێکە کە دائیمەن خۆی بەخشوع ئـەزانێ، دڵێکـە زەلیلـە بەرامبـەر خـوا، دڵێکـە پەشـیمانە بەرامبـەر ئـەو گوناهانەی کردیەتی، دڵێکە شەرمەزارە بەرامبـەر رب العـالمين لەبـەر ئـەوەی بێ شەرمی خوای گەورەی کردووە، ئێستاش تۆبەی کردیـە هـەر شـەرمەزار یەکەی بەبیردێتەوە ﴿وجاء بقلب منيب ادخلوها بسلام] ئـەم دلانـە، ئـەم دڵە مونیبانـە بابـچنە نـاو بەهـشت ادخلوهـا بـسلام، بڕۆنـە ناوبەهەشـت بەسەلامەتی بەبێ ئەوەی کە س راتان بگرێ و پێتان بڵێ ﴿وقفـوهم انهـم مسؤلون﴾ رایـان بگـرن ئێوە بەرپرسیارن، حـسیاب وکتابتـان لەسـەر تونـد بکـات زۆر بەئاسـانی ئـەرۆن، هـەموو قۆناغـەکانی قیامـەت ئـەبرن، لەسـەر پردی سراط، وەکو بروسك وەعدی پێداوون هـەتا هەتایـە بـۆ خۆیـان لـەناو دەمینێتـەوە و ئـەژین، خۆشـحالی و خۆشـبەختی لـەبۆ ئـەو کەسـانە کـێ؟ ﴿وجاء بقلب منيب﴾ کەسێك کەساحێبی دڵی مونیـب، بـێ بەڕاسـتی ئێمـە دڵی مونیبمان پێویـستە کـە ئـەم دڵە بگەڕێتـەوە لای خـواو بترسـێ لـەخواو شـەرمەزار بـێ بەرامبـەر رب العـالمين، جاخۆشەویـستانم ئیمـامی قـورطبی دەفەرموێ دڵی مونیب ئەو دلەیە (مقبل على الطاعات) ئەم دڵە چووست و چالاکە بـۆ عیبـادات، کاتێـك بـەیانیان گـوێ لەبانگـە مزگەوتەکـەی چـەند مەترێك دوورە لەمالیان، ئەو بانگ دەرە بانگ دەفەرمووێ (الصلاة خير مـن النوم) ئـەو ئینـسانە شـانی خـۆی وەردەگێـری، خـەوی خـۆش تـر دەکا گوێ نـاداتی ئـەوە بـانگی ئـەکاو پـێ ئـەلی حـی علـى الفـلاح وەرنـە سـەرفرازی نوێژبکەن و خۆتـان سـەر فـراز بکـەن لەقیامـەت، ئەسـلەن دڵـی تونـد دەبـێ بەبانگەکەش غەم دەخوا و دەڵێ کەی ئەبێ بەیانیان بانگدانیان هەلگرتبایە خەوم لێ ئەتۆرێنی، ئەوانە ساحێب ئـەم دلانـە نـین دلی مونیـب ئـەو دڵەیـە

کەگوتی حي على الصلاة حي على الفلاح کە گوتی الصلاة خير من النوم، یەکسەر هەلئەستێتەوە بەچوستی هەڵدەستێ عیباداتی خۆی بەجوانی و رێکی ئەکا، (نشیطە غير كسلانە) چالاکە تەمبەل نیە ئازایە بەورەیە لەبۆ هەموو کارێکی خێر، ئەم دڵە هانی ئەدا کەبچێتە خزمەت خوا، لەمەیدانی خێر خوازی ئامادەبی لەمەیدانی چاکەکاران ئامادەبی بۆ مزگەوت بۆ خزمەت کردنی دینی خوا بۆ خزمەت کردنی رێبازی محمد المصطفى ﷺ بۆ چاکەکاری هەموو کاتێك لەپێشەوەیە، جا ئەبو بەکری وەراق یەك لەزانایان و پیاو سالحەکانە، دەفەرموێ دڵی مونیب چەند مەرجێکی هەیە ١) یەکەمینان العارف لحرمتە، ئەزانی حدودی خوای گەورە چۆنەو چۆنی داناوە، حدودی خوای گەورە نابەزێنی ئەزانی ئەم شتانە حەرامن نایکا وەخۆی لێ ئەپارێزی دەفەرموێ ٢) وەلائو بەرائی هەیە لە دینی خوای گەورە، کەسێك خۆش ئەوێ کە خواو پێغەمبەر ی خوای خۆش دەوێ وەرقی لەکەسێك ئەبێتەوە کەدوورە لەخواو لەپێغەمبەری خوا جابا برای بێ، بانزیکترین کەسیش بێ، خۆشەویستانم دەفەرموێ ٣) (متوضعاً لجلالە) زۆر زۆر ملکەچە بەرامبەر جەلال و عەزەمەتی خوای گەورە.

ملکەچە زەلیلە خۆی بەشەرمەزار ئەزانێ، مەرجی چوارەم دەفەرموێ ٤) (تارك لهوى نفسە) هەروەها ئەوەی هەواو ئارەزووی نەفسی گەرەکیتی وازی لێ دێنێ نایکاتن، جا خۆشەویستانم بایەك بەیەك بەشەرتەکان دابچین، **یەکەمین** شەرتی ئەو دلەی مونیب (العارف لحرمتە) سنووری نابەزێنی ئەوشتانەی کەقەدەغەکراون لەحەلال و حەرام نایبەزێنی ئەگەر شتێك حەرام بێ هەموو دونیای بدەنێ نایکا، ئەگەر شتێکی حەلال بێ هەر ئەو دەکاو بۆ ئەو ئەچن ئەو شتانەی کە خوای گەورە خەتی سۆری بەسەریان

دانایــه پــێ دانــاروا، دەزانــێ ئەوانــە مایــەی فەوتانیــەتی ئەوانــە مایــەی
توورەبوونی خوای بەسەر دابێتە خوار، خۆشەویستانم ئێمـە چەندمان کـە
تووشی حەرام بـووین وەقفەمان کـرد، چەندمان کـە پێیـان دەگوتین ئـەوە
حەرامە نەیکەن، وە (الله)ی ئێمە لەبەر ماڵی دونیا و لەبەر فیتنـەی دونیـاو
لەبەر خۆشەویستی دونیـا چاومان قـەپات بـووە، هـەر دەمانـەوێ پـارە زۆر
بکەین مولك و ماڵ و سەروەت وسامانی دونیا لەسەر یەك دابنـێ، وا دەزانـێ
ئەمـە بەختەوەریمانـە، وا دەزانـین خۆشـیمان بەوەیـە، وە (الله)ی خۆشـیمان
پارەی دونیا نیە، خۆشی بەدڵە، خـوا دڵتـی خـۆش کـرد، بافلوسـێکت نـەبێ،
لەهـەموو خـەڵکی بەختــەوەرتری دلخـۆش تـری، خۆشەویـستانم کامــەرانی
لــەناو دڵــە، بەختــەوەری لــەناو دڵــە، بــەس چ بکــەم خــەڵك وادەزانــێ
بەختــەوەری لەدونیایــە، وائــەزانێ بەختــەوەری لەمەنــسەبە وائــەزانی
بەختەوەری بەکورسیە و بـەفیزە و بەگەورەییـە، نـەخێر وە (الله)ی ئەوانـە
هـەموو فـەوتاون ئەگـەر ئاگایـان لەخۆنـەبێ، ئەگـەر بـەپێی شـەرعی خـوا
نەجولێنەوە، جا خۆشەویستانم، ئەبێ وریابین زانـابین، ئـەو شـتانەی خـوای
گەورە حەرامیان کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ حەرامیان کردوە لیان نزیك
نەبیتەوە چونکە ئەوشتانە بەهیلاکت ئەبا ئـەو دڵانـەمان تووشـی قەسـوەت
دێ، توشی رەشی دێ توشی مـردن دێ، **دووەمیان** وەلائـو بـەرائمان تـەواو بـێ،
بەڕاسـتی خۆشەویـستانم ئێمـە وەلائـو بـەرائمان نـەماوە، وەلائـو بـەراء لـە
عەقیـدەی ئیـسلامی، وانەیـە کـە لـە وانـەکانی عقیـدەی ئیـسلامی لـەبیرو
بـاوەری ئیـسلامی، بـەلام ئێمـە نیتمـان، کەسـێکمان خـۆش دەوێ کـەزالم و
موجریم و خوانەناسـە، تـەنها چونکە خزمیـەتی رقـم لەکەسـێك دەبێتـەوە
خواناسێکی رێك و پێك چونکە لەئێمە نیە، خۆشەویستانم وانا بێ دەبێ تـۆ

کەسێکت خۆش بوێ کەخواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێ بالەقەومی تۆ نەبێ بالەخەتت نەبێ، بادوور بێ بانەی ناسی، مادام خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێ، دەبێ تۆش خۆشت بوێ باهەر کەسێك بێ باخەڵکی هەر وولاتیك بێت لەهەر رەنگ و پیشەیەك بێ، رقم لەکەسێك ئەبێتەوە بوغزو عەداوەتم بۆ کەسێکە کەدوژمنی خواو پێغەمبەر ی خوا بێ، با باوکم بێ بابرام بێ، باهەموو نزیکەکانی خۆم بێ ئەم باسە لەقورئان وحەدیث زۆر باسی کراوە (من احب لله وابغض لله ومنع لله واعطى لله فقد استكمل ايمانه) پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ کەسێك یەکێکی خۆش ویست لەبۆ خوا، رقی لێ بێتەوە لەبۆ خوا، ئەوە شەرتی ئیمانە، براکەم وەلانو بەرائمان تەواو ئەوێ، ئەمە ئەمانەوێ ئەگەر بتەوێ کەسێکت خۆش ویست قیاسی خۆشەویستەکەی مالْ و سەروەت و حزبایەتی نەبێ، قیاسی خۆشەویستەکەی ئەوەیە چەند لەخوا نزیك ترە، چەند پابەندی شەرعی خودایە رقی لەکەسێك ئەبێتەوە کەدوورە لەخوا، باهەموو کەسم بێت باگەورەی عەشیرەتم بێ بانزیکم بێ، مادام شەرعی خوای پێ قبول ناکرێ، مادام دوژمنی خواو پێغەمبەرە لەناو دڵی خۆم جێگای ناکەمەوە، دڵی مونیب ئەو دڵەیە کەوەلائو بەرائی تەواوە، لەسیرەی پێغەمبەرەکان بخوێنەوە صلاە وسلامی خوایان لێ بێ بزانە خوای گەورە چۆن مەزبووتی کردوون لەمەسئلەی وەلائو بەراء چۆن زەبتی کردوون، تۆ ئەی پێغەمبەر کەسێکت خۆش بوێ کەئێمە خۆشمان دەوێ وەکەسێکت رق لێ بێتەوە کە ئێمە رقمان لێ یە، تەواو ئەوە شەرتی ئیمانە روکنی عقیدەی ئیسلامیە، خۆمان فەوتاوین، بەراستی ئێمەی کورد فەوتاوین لەو ناحیەیەدا ئێمە زۆر زۆر ئیهمالین بۆیە هەموومان دڵمان مردووە توشی نەخۆشی هاتووە، خالْی

سێ یەم (متواضعاً لجلاله) ئەم دڵە متواضع بێ کە نوێژ دەکەی مەغرور مەبە، وانەزانی هەموو شتێکت دا بەخواو بەندایەتی تەواوت لەبۆ خوای کرد، نوێژ دەکەی هەر ئاگات لەنوێژ نیە بەچ مەغرور دەبی برام، بەچ تەکەبور دەتگرێ بەرامبەر خوا رادەوەستی موکەسەربە بادڵت کەسەری تێدا بێ، باشکاوە بێ بەرامبەر خوای گەورە بائەم دڵە شەر مەرزار بێ.

نوێژدەکەی خۆت زۆر بەکەم بزانە بەرامبەر عەزەمەت و جەلال و جەبەروتی ئەو الله یە، خۆشەویستانم تۆ بەرامبەر عیمارەیەك رادەوەستی تەماشادەکەی دەڵێی ماشاء الله لەو عیمارە گەورەیە، خۆت بەکەم دەێتە پێش چاو، ئەی بەرامبەر خوایەك کەکەون کائیناتێك هی ئەوبێ خۆت بەچی دێتە پێش چاوت، تۆ دەسەڵاتی یەك مێشولەت نیە.

مێشێك ئیزعاجت دەکا دەسەلاتت نیە، ئەدی خۆت بەچ دەزانی؟ کەمێك ئاو لەناو سکت بمێنێتەوە هەتا بەیانی هاوار ئەکەی، خۆت بەچ دەزانی تۆ یەك مێشولە بچێتە ناو مێشکت شێتت دەکا بەچ مەغرور دەبی، جاخۆشەویستانم دەبێ متەوازع بی بەرامبەر خوای گەورە ئەبێ مونکەسر بی ئەبێ شکاوە بی بەرامبەر خوا ئینجا خوا بەرزت دەکاتەوە، دڵی ئێمە دڵێکی موتەکەبیرە بەرامبەر خوای گەورە، کەرادەوەستین بەرامبەر خوا وانەزانین هەموو شتێکمان کردووە کە هیچیش وەنیە، بۆیە ئەو کەسانەی کە لەدەرگای متواضعی دەچنە ژووری زۆر کەمن ، کەمی تێدایە بەرامبەر خودای گەورە خۆی بەشەرمەزارو زەلیل و زەبوون و فەقیر و مفلیس و هەژار تێبگا.

خۆشەویستانم ئێمە فەقیرین بەرامبەر خوا ﴿ یاایها الناس انتم الفقــراء الی الله والله هو الغني الحميد﴾ خوا بۆ خۆی دەفەرموێ خەڵکینە ئێوە فەقیرن

بەرامبەر خـوا هـەر خـوا دەولەمەنـدە، تـۆ چـی؟ تـۆ بـەپارە مـەغرور دەبـی تۆزێك دۆلار دێتە خوارێ فەقیر دەبێ، كێڕا لەبیرمان كـرد ئەوانـەی هـەموو بیست و پێنجیان لەسەریەك دانابوو كەرەفز بـۆوە هـەموو توشـی نـەخۆشـی دڵ بوون یەك حەفتە لەسەر جێ نەیدەتوانی بجولێتـەوە وەخـت بـوو شـێت بێ لەبیرمان كرد، بەس ئێمە نابێ مـەغرورو بـین، نـابێ ئـەم دڵـەمان كـبری تێـدابێ بـەڵكو دەبـێ متـەوازع بـێ بەرامبـەر رب العـالمین دا، وەهـەروەها ٢) (تارك لهوى نفسه) ئەم دڵە ئـەوەی نـەفس و هـەوای دەیـەوێ نایكا خـۆی لێ دەپارێزی، لەخوا ئەترسێ، كاتێك كەس لەلای نەبوو ئینجا فرمێسكی دێتـە خوارێ، ئەگریێ بۆ گوناهەكانی دەگریێ بۆ شەرمە زاری خـۆی، دەگریـێ بـۆ كارەكانی كەهیچ نین پـڕن لـەریاو موكەسـەرە، ئـەڵێ ئـەی ئیلاهـی مـن بـەو كـارەوە بێمـە خزمـەتت وە (الله)ی هیـچم نیـە بۆیـە شـەرمەزارو فـەقیرو مسكینی بـەرقاپی تـۆم، خۆشەویستانم بزانـە پێغەمبـەر ﷺ ج دەفـەرموێ (سـبعة يظلـهم الله في ظلـه يـوم لاظـل الا ظلـه) حـەوت كـەس هـەن لـەرۆژی قیامەتێ ئەو حەوتە ئەزیـەت و ئـازارو ئەشكەنجەی مەحـشەر نـابینن، ئـەم كەسـانە كەزینـدوو بوونـە، مەلائیكـەتانی خـوا هـەڵیان دەگـرن ئـەیان بـەن لەشـوێنێكی دایـان دەنـێن ئـەم شـوێنە سـێبەری عەرشـی خوایـە، دەبـێ ج جێگایە بێ ج فێنكاتیەك بێ، نەبەدەن ئەو خۆرە كەخەڵكی قەلس كـردووە، كـە خـەڵكی بێـزار كـردووە بـەو هـەموو گـەرمای خـۆر كـە لەسـەریان ئـەداو هەموو لەشیان ئارەقەی لێ دێتە خـوارێ ئـاویش نیـە كێمـاو هەیـە ئارەقـەی خـۆت هەیـە بیخـۆن، هیـچی كەنیـە بیخـۆن، وایـان لێ دێ هـەموو خـەڵكی تەمەنا دەكا، خوایە بـەس حـساب دەسـت پـێ بكـات لـەو عەزابـە قوتـار بم و قوتار بوون نیە هەتا ئەو كاتەی خودا ئیزن ئەدا.

ئەم خەڵکە لەو هەموو ئەزیەتە دان،بەڵام ئەو کەسانە پارێزراون،ملائکەتی خوا لێناگەڕێ ئەوانە عەزاب بخۆن،یەکسەر دێن مەلائیکەت هەلیان دەگرن لەو شوێنە فێنکە و خۆشەیان دادەنێن، جا ئەوان تەماشای خەڵکی دەکەن ئای ئەو خەڵکە لەچ عەزابێك دان ئەو فلانە بزانە هەتا چۆکی ئارەقەیە ئەوە فلانە هەتا ناوکی ئارەقەیە ئەوە فلانە غەرق بووە لەناو ئارەقەی خۆی دایە، ئای خودای میهرەبان ئەوانە لە چ عەزابێك دان هاوار دەکەن سبحان الله کەس جوابیان ناداتەوە، ئەوە چیە هەموو خەڵك کۆدەبنەوە بۆکێ ئەچن؟ دەچن پەنا دەبەن بۆ باوکە ئادەم، لەباوکە ئادەم دەپارێنەوە، یا ئادەم ئەی باوکی پێغەمبەران، ئەی ئەو کەسەی کەیەکەم کەس خودای گەورە دروستی کردووی هەموو مەلائیکەتەکان بەئەمری خوا سوجدەیان بۆ بردی، لەخوا بپارێیتەوە بەس خوای گەورە حیسابمان لەگەڵ بکا، ئەوانیش لەو خۆشیەی وا دانیشتون، دەڵێن هەزار حەمد و سەنا کەئێمەت پاراست لەو ناخۆشەیەدا، خودایە دەبێ ئەوان چیان کردبێ، ئەوانە چ کارێکیان کردبێ ئەوا لەو جێگایە بەقەدرو قیمەتە دایان ناوون خۆ ئەوە سەرەتایە ئەگەر حیساب دەست پێ بکا ناخۆشی نابینن، ئەوانە لەسەرەتا ناخۆشی نابینین هەتا ناوبەهەشت راناوەستن، حەوت چینن حەوت بەشن یەك لەو چینە ﴿ورجل ذكر الله خالياً ..﴾ کەسێك پیاوێکە یان ئافرەتێکە، لاوێکە کچە عازەبێکە پیرەژنێکە، مام حاجیەکە، مەلایەکە، کاتێك بەتەنیا ئەبێ فکر لەخۆی ئەکاتەوە، فکر لەگوناهو بێ شەرعیەکانی خۆی دەکاتەوە، دەفتەری کاری خۆی هەڵئەداتەوە هیچی نەکردوە بۆ خوا، ترسی خوای لێ ئەنیشێ ﴿ ففاضت عينـــاه ﴾ فرمێسکەکانی لەچاو دێتە خوار ئەو کەسە لەقیامەتێ بەو فرمێسکانە ئەو عەزابە ناچێژێ لەسێبەری عەرشی خودا

ژیان ئەباتە سەرو ڕێزو ئیحترامی ئەگرن، دەبراگیان خوشکی بەڕێزم، دە دووفرمێسك برێژن لەترسی خودا دەزانی ئەم فرمێسكانە وەزنیان چەند قورسن راستە لەلای تۆ وەزنیان نیە بەلاّم لەمیزانی قیامەت و میزانی خوای گەورە زۆر قورسە خۆشەویستانم ئەو فرمێسکەی تۆ بەهەر شوێنێك دابڕوا ئەو شوێنە ئاگر نایسوتێنێ بۆیە پیاو سالحەکان کەئەگریان هەمو لەشیان پێ تەر دەکرد.

کەفرمێسکێك لەترسی خودای گەورە هاتە خوار ﴿عینان لا تمسهما النـــار﴾ دوو چاو هەنە ئاگر نایانسوتێنی، چاوێك لەترسی خودا گریابێ وە چاوێك لەراهی خوا حەرسیاتی بگرێ، جاخۆشەویستانم دوو قەترە فرمێسکی تۆ دوو قەترە ئەسرینی تۆ وەت لێ بکا دڵت نەرم بێ، دەزانی ئەگەر فرمێسکت نێتە خوار ژیانت شڕە لەقیامەت، بۆیە دەکولێ دەکولێ تاکو کولینەکە لەچاوت بورکان دەکاو لەچاوانت دێتە خوار، خەڵك لەقیامەتدا هەموو دەگریێن ئەو ئاگریێ بۆ بگریێ، ئەو لەدونیا گریاوە زۆر کەساس و ناخۆشی دیوە لەدونیا زۆر ئەشەنجەو ئازاری دیوە لەدونیا زۆر شکاوە زۆر شەرمەزار بووە بەرامبەر خودا ئەمڕۆ ناگریێ، خوای گورە ناهێلی بگرێی ئیمرۆ گریان بۆ تۆ نیە تۆ ئەبێ پێبکەنی.

خۆشەویستانم ئەی ئەو کەسانەی دەتانەوێ لەقیامەت پێ بکەنن ئەی ئەوکەسانەی دەتانەوێ لەژێر سێبەری خودا لەقیامەت دا بژین ئیمرۆ بگرین دەفتەری ڕەشی خۆتان بکەنەوە بزانە، چیت کردوە، بزانە چیت تۆمار کردووە، وە (الله) ئێمە زۆر گوناهمان کردووە لەبیرمان کردوە، خوای گەورە لەبیری نەکردوە، خوای گەورە هەمووی تۆمار کردووە ﴿مایلفظ مـــن قول الا لديه رقيب عتيد﴾ خوا ژماردیتی ئێوەش لەبیرتان کردووە ﴿ احـــصاه

الله وئــــسوه﴾ خـوای گـهوره هـهموی ژمـاردوون بـهلأم ئێمـه لـهبیرمان کـرد، خۆشهویستانم کاتێك ئهوها سهعاتێك دائهنیشی یادی رۆژانی پرگوناهو پـڕ ستم وبێ سهروبهری خۆت ئهکهی باشه بـهو هـهموو گوناهـهوه بهخزمـهت خـوا بگـهی چ دهکـهی؟ باشـه بـهو هـهموو روو رهشـیهیهوه بهخزمـهت خـوا بگـهم چیم بهسـهر دێ؟ چ وهلأمـی خـودا ئهدمیتـهوه؟ ئائـهم دڵـه ئـهکوڵی ئهمهیه دڵی مونیب پهشیمان و شـهرمهزاره چۆن دڵێ ئهچێتهوه خزمـهت خوا؟ نـا ئـهبێ مونیـب بـێ، ئـهبێ دائیمـهن فکـر لـهگوناهو بـێ شـهرعیهکان بکاتهوه تاکو فرمێسکهکانی چاوی لهسـهر تـهرازووی عهمـهلی قـورس بـێ و نهجاتی بێ، خۆشهویستانم بائهم فرمێسکانه کهس نهبینێ، ئهگهر مامۆسـتا یـهکیش قسهیهکی باشـی کـرد مـهگریێ، چۆن بگـری بـا ئـهم فهرموودهیـه بتگرێتـهوه بـۆ لای خـوا بهقـسهی فـلان و فـلان و مـهگریێ قـسهکان لـهدڵ ههلگره تۆماری بکه، کهشـهو چویتهوه مـاڵ سـهرت لهسـهر بالیفهکـهت دانـا ئینجا بگریێ پیاو سالحی واههبوو، ئهی فهرموو نیوهی سهرینم تـهڕ دهکـرد له فرمێسکهکانم، نهم دههێشت خێزانهکهم بزانێ که لهسـهر یـهك بـالیفیش نووسـتوینه ئێمـه ئهگـهر فرمێـسکمان بێتـه خـوارێ دهبـێ هـهموو مزگـهوت بزانێ مامۆستا گریـا، هـهموو کـهس بـزانن فلان گریـا، باوکـه گیـان باکـهس نهزانێ، رۆژێکیـان ئیمـامی ئـهوزاعی میوانـهکی هات ئافرهتێـك بـوو، چووه ژووری مهکتهبهکـهی ئیمـامی ئـهوزاعی، دیتـی جێگـای سـهر بهرمالهکـهی نوێژی لێ دهکر تهڕبوو، ئافرهتهکه گوتیـه خێزانی ئیمامی ئهوزاعی توخـوا خوشکی بهڕێزم ئهوه چیه بـۆ لێ دهگـهڕێی منـداڵ بێتـه ژووری میـز بکـهن، ئـاخر ئێـره جێگـای ئیمـامی ئهوزاعیـه نوێـژی لێ دهکـات، خێزانهکـهی فهرمووی منداڵی چی و میزکردنـی چی وه (الله)ی ئـهوه جێگـای سـوجدهی

شەوانیەتی، سبحان الله تابەیانیش هیشك نەبووە ئەوەندە گریاوە لەترسی خودا، كوا ئێمە ئەگرین، ئەگەر نەگرین ئەم دڵە نەرم نابێ، رەق بووە بویتە بەرد بەفرمێسك نەرمی بكەوە، ئەبێ بكوڵێ بەكولان ئەبێ، بەچ ئەكوڵێ بەیاد كردنەوەی ئەو هەموو گوناهانەی كەكردیتم، جاخۆشەویستانم بابێین ببینین بەساحێبی دڵی مونیب ئەم دڵەی كەخوای گەورە پێی دەفەرمووێ ﴿ادخلوها بسلام﴾ دەبرۆ نە ژووری بۆ ناو بەهەشت، ئەمەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئیمامی ئەبوبەكرە و ئیمامی عومەر، ئەو هاوەڵە بەرێزەكانن، ئەوە ئەولیایەكانن، ئەوە پیاو سالحەكانن دەی برۆراكە ﴿ذلك یوم الخلود﴾ هەتا هەتایە ژیان لەگەڵ وانە ئەبیتە سەر، یارەبێ خودایە لەبۆخاتری ناو جوانەكانت لێت ئەپارێمەوە دڵی مونیبمان بەقسمەت بكەی و پێمان بدەی ژیانیش لەگەڵ پێغەمبەران و هاوەلان و یارانی بەقسمەت بكەی، لەناو بەهەشتی فیردەوس دا و *صلى الله على محمد وعلى اله وصحبه أجمعين* ..

هەتا دەرسێكی تر بەخوای گەورەتان دەسپێرم .

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته .

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

**خۆشەویستانم ئازیزانم پێ خۆشحاڵم لەدەرسی نۆیەم لەزنجیرە بابەتی تەزکیەی نەفس، کەلەژێر ناونیشانی گەشتێك بەناخی مرۆڤەکان دابەخزمەت ئێوەی خۆشەویست دەگەمەوە، ئومێدەوارم بتوانم لە خزمەت ئێوەی ئازیزو خۆشەویستدا شتێك بکەین، بۆ ئەوەی ئەو دلانەمان خوای گەورە لێ رازی بێ، خوای گەورە دڵێکی زیندوو مطمئن و سەلیممان بەقسمەت بکا، جالە خوای گەورە ئەپارێمەوە، ئەی خودای میهرەبان، خودای تاك و تەنها، ئەی خودای عظیم لێت دەپارێنەوە لەگوناهەکانمان خۆش بی عەفومان بکەی خوایە دڵمان بەنوری خۆت منەوەر بکەی، خودایە ئەو دڵە مردوانەی ئێمە بگۆڕی بەدڵێکی زیندوو، یارەبی خودایە لەبۆ خاتری ناوە جوانەکانی خۆت ناسینی خۆتمان بەقسمەت بکەی، خودایە تام و لەزەتی عیبادەتی خۆتمان بەقسمەت بکەی، یارەبی خودایە لەدایك و باوکمان خۆش ببی، خودایە لەموسیبەت و بەڵاو غەم پەژارەبمان پارێزی یارەبی خودایە بمان پارێزی و محفوظمان بکەی یاالاکرم الاکرمین یاالله، خۆشەویستانم ئەو دڵەی ئەو جارە باسی دەکەین، لەو دلانەی کەسپین دلی وەجیلەیە، خاوەنی دڵی وەجیلە دڵێکە سیفەتی وایە هەر کاتێك گوێی لەقورئان بێ یان لەوتارێك یان مەشهەدێکی بیست یان مەشهەدێکی بینی، یەکسەر ئەم دڵە ئەترسێ و فەزەع و جەزەغ دەیگرێ، بۆیە خوای گەورە لەقورئان دا باسی دەکاو دەفەرمووێ ﴿ انما المؤمنون الذين اذا ذكر الله وجلت**

قلوبهم وإذا تلت عليهم آياته زادته ايماناً وعلى ربهم يتوكلون﴾ بزانە خوای گەورە چەند جوان وەسف و مەدحی ئەم دڵە دەکات دەفەرموێ ﴿ انما المؤمنون الذين اذا ذكر الله وجلت قلوبهم﴾ بەڕاستی ئیمانداری ڕاستەقینە ئەو کەسەنە کاتێك ناوی خودا دێ لەلایەن، کاتێك کەخودایان بەبیردێتەوە ﴿وجلت قلوبهم ﴾ ئەم دڵە ئەترسێ لەترسی خودا، ئەم دڵە ئەلەرزێ و گرژ دەبێتەوە بەناو خۆیدا خەوفێك و هەیبەتێکی ئەو ئیلاهەی دەکەوێتە ناوی ﴿ واذا تليت عليهم آياته﴾ خۆ ئەگەر ئایەت و نیشانەو عەزەمەتی خوای گەورەیان بەسەر دا بخوێنتەوە ﴿زادتهم ايمانا﴾ ئیمانی پێ بەرز دەبێتەوە، ئیمانی پێ دامەزراو دەبێ، ئیمانی پێ زیاد دەبێ، جاخۆشەویستانم ئەم دڵە ئیمامی شەوکانی مەدحی دەکاو دەفەرموێ ئەو دڵی وەجیلەیە، دڵێکە بەڕاستی ئەترسێ و وەحاڵەتێکی نائارامی تووش دەبێ لەبەر ترس و هەیبەت و عەزەمەتی ئەو خودایە، جا تەماشاکە دڵی ئێمە لەکوێ و دڵی وەجیلە لەکوێ، دڵێك ئەگەر یادی خوا بکا بلەرزێ، دڵێك ئەگەر خوای بەیاد بێتەوە بلەرزێ، دڵێك ئەگەر خوای گەورە بەیاد بێتەوە لەسەر هەر گوناهێك دەست هەڵدەگری یەکسەر هەڵدەستێتەوەو تەوبە دەکا، توخوا ئێمە ئاواین، نەخێر ئێمە لەسەر گوناه، بانگی الله اكبر دەبیستین سبحان الله تەقەی سەرمان دێ، ئێمە والەسەر مردوین ، مردوو ئەشۆین، مردویان داناوە چوار پێنج کەس ئەیشۆن، ئێمەش والە حەوشەکە راوەستاینە فیکەی جگارەمان دێ، ئەڕۆین هەرغەیبت دەکەین، مردوەکە ئەبەینە ناو قەبر بۆخۆمان دەینێژین، ئەی ئەمە نیشانەو عەزەمەتی ئەو خودایە نیە ﴿إِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً﴾ الانفال/٢، کەی ئێمە واین کاتێك ئایەت و نیشانەی عەزەمەتی خودا ئەبینین و ئەبیستین ئیمانمان پێ زیاد دەبێ،

نـەخێر دەی کەواتـە ئێمـە خـاوەن دڵێکـی مـردووین، بـڕوا بکـەن ئێمـە دڵـی زینـدوومان نیـە، ئەگـەرنا جووڵەیـەکی ئـەکرد بـەڵام سـبحان الله ئـەو دڵـەی ئێمە هەرگیز لە هیچ حالەتێك دا جووڵە ناکا، جاخۆشەویستانم دڵی وجیلـە ئەو دڵەیە کاتێك ئەگەر بیەوێ گوناهێك بکا یـان گوناهێـك بکـا یـان لەسـەر گوناهەکە بێ پێی بلێن اتق الله یەکسەر دەکشێتەوە، تەواو تازە ئـەم کابرایـە خوایان بەبیرهێناوە، ئەم دڵـە عەزەمـەت و هەیبـەتی ئـەو خودایـە گـەورەی بەبیرهاتـەوە ئـەو رۆژەی بـەیاد دێتـەوە، کـە خـوا بەرامبـەرت رائەوەسـتێ و پرسیارت لێ دەکا، ئـەو رۆژەی بـەیاد دێتـەوە کـە خـوای گـەورە یـەك ..یـەك پرسیارو وەڵامی لەگەڵ دەکاتن، بۆیە تێك دەچێ و هەڵدەستێ وتەوبـە دەکا وەبڕیار ئـەدات جارێکی تـر نەگەڕێتـەوە سـەر هـیچ گوناهێـك، جارێکی تـر خوای لەخۆی تورەنەکات.

جاخۆشەویستانم بەڕاستی ئـەم دڵەش دڵێکـە لـەو دڵـە سـپیانەی کـە خـوای گـەورە کردیتیـە خـەلات و دیـاری بـۆ ئیمانـداران، چـونکە ئـەم دڵـە هـەموو کاتێـك یـادی خـوا دەکـا، لەهـەمو کاتێـك لەحالـەتێکی خـەوف دا دەژی بـۆ ئـەوەی پـارێزراو بـێ، لـەو هـەموو گوناهانـەی کـە ئینـسان تووشـی دەبێـت، ئەوەتە ئیمامی ابو حەنیفە رەزای خوای لێ بێت، رۆژێکیـان نوێـژی عیـشایێ دەکرد، کوڕە گەنجێك زۆر دەنگی خۆش بـوو بـەپێش کـەوت و نوێـژی کـرد، ئیمـام ابوحەنیفـە لـەدوای ئـەم گەنجـە نوێـژی کـرد، کـوڕە گەنجەکـەش لەرکعەتی دووەم ﴿اذا زلزت الارض زلزالها﴾ ی خوێند  واتە سورەتی الزلزلـە ، سبحان الله یەکسەر حالەتی ئەم ئیمامە تێك چوو، وەزعێکـی زۆر غـەریبی بەسـەر داهـات، هـەتا نوێژەکـە تـەواو بـوو، ئیمـام لەشـوێنی خـۆی دانیـشت، خەلکەکـە هـەموو چـونەوە مـاڵی خۆیـان، ئـەو هـەر هەلنەسـتا خـادمی

مزگەوتەکە ئەڵێ کەس لەمزگەوت نەماوە، ویستم بلێم یائیمام بۆ خۆت فانۆسەکە بکوژێنەوە ئەوکات فانۆس نەبووە قەندیل بووە، تۆزێك زەیتیان تێ دەکرد و فتیلەکی بچوکی هەبووە گوتی کەمی زەیتی تێدامابوو بەشی نەدەکرد پاش نیوسەعاتی دەکوژاوە ویستم بەئیمام بڵێم یائیمام توخوا خێراکە ئەوە کو فانۆسەکە یاخود قەندیلەکە بکوژێتەوە، دڵم نەهات بەجێم هێشت ئەو شەوەچوومە ماڵی خۆم نوستم تابەیانی لەبۆ نوێژی بەیانی دەبینم ئیمام ابو حەنیفە هەروا دانیشتوە، ئەوا ردێنی خۆی گرتوە حیساب لەگەڵ خۆی دەکا، دەڵێ ئای ابو حەنیفە ئەی نەعمان بزانە چ خودایەکی عەزیمە لەسەر سەرت، ئەو خودایەی لەسەر مسقالە زەرەیەك لێت ئەپێچێتەوە لەسەر مسقالە زەرەیەك لەسەر خێر لێت ئەپێچێتەوە، ئەی خودای میهرەبان بەخۆت لوتف بکە لەگەڵ نەعمانی و لێی خۆش بە، عەفوی بکە، گوتی ئەش گریا زۆرم پێ سەیر بوو تەماشای قەندیلەکەم کرد یاسبحان الله هەر وەکی خۆیتی هیچ کەم نەبووە، گوتی چووم بانگ بدەم، هاتمە ژورێ گوتی ها دەتەوی چرایەکە ببەی؟ گوتم نا یائیمام قەندیلەکە نابەم، ئیشم بەقەندیلەکە نیە، هاتم نوێژی بەیانیە بانگ دەدەم گوتی سبحان الله نوێژی بەیانی، فەرمووی توخوا ئەوەی دیتت بەخەڵکی رامەگەیەنە ، باسی مەکە ﴿إِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً﴾ الانفال/٢، تەماشاکە ئەوە دڵە، دڵێکی وایە یەك شەوی دوورو درێژ لەبەر یەك ئایەت خەوی لێ نەکەوت ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ الزلزلە/٧-٨ خوای گەورە دەفەرموێ رۆژی قیامەتێ ئەو رۆژەیە هەر کەسێك یەك مسقالە زەرە خەیر بکا دەیبینێت، یەك مسقالە زەرە چەند بچوکە هەر ئەوەتە بەچاو دەبینرێ، یەك مسقالە زەرە تۆ خێر بکە ﴿وَمَن

يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ الزلزلـه/٨، و (الله) بەقـەدەر یـەك مـسقاله زەرەش گوناهت کردبێ، هەموو دێتەوە ڕێت، جاتوخوا بـۆ تـۆ لەئێـستاوە بـۆ خـۆت حیسابێك ناکەی، مادام حیسابی مسقاله زەرەیەکمان لەگەڵ بکەن، بۆ ئێـستا لـەخۆت ناپێـچیتەوە، غـەمێکیش لـەخۆت نـاخۆی، خۆشەویـستانم تەماشـای حالی خۆمان بکەین کوا ئێمـەواین دادەنیـشین لەتـەعزیان دەسـت بـەقورئان خوێندن دەکرێ، ئەو خەڵکە هەر گوێش ناداتێ بڕوا، بکە هەر ئەوەندە دڵی تونـدە کاتێـك قورئانەکـە دەخوێنـدرێ هـەر مامۆسـتاکە گـوتی صـدق الله العظـیم.. الفاتحـة .. کـابرا دەگەشـێتەوە کەئەنـەما لەسـجن بـەربووە، وەکـو کابوسـێك لەسـەر سـەریەتی، خـوا خـوایتی مامۆسـتاکە قورئـانی تـەواو بکـا، لەبەر ئەوەی باس و خواسێکی لەگەڵ ئەوەی تەنیشتی هەیە، ئەمەکەی دڵە لەتەعزیە دەبێ مردنـی خـۆت بـەبیر بێتـەوە، دەبـێ بزانـی ڕۆژێـك لـەڕۆژان ئەو لافیتـەیە لەپێش دەرگەی مزگەوتەکەی هەلواسراوە کـە نوسـراوە فلانـی کوڕی فلان، ڕۆژێك دادێ ناوی تۆ ئەنووسرێ، تـۆ لـە تەعزیـەی فلان کـەس دانیشتی ڕۆژێك دێ خـەڵکانێك لەتەعزیـەی تـۆ دادەنیـشن، چەند جار ئـاوا لافیتـان دەخوێنـەوە، ئـەی سـبحان الله فلانـیش مـردووە ئـەم تەعزیـە بـۆ ئەوەیە خودات بەبیر بێتەوە حەشرو قیامەتت بەبیربێتەوە، ئـەوە بـرادەری خۆت بوو چەند ڕۆژێك پێش ئێستا پێکەوە بوون، پێکـەوە قـسەتان دەکـرد، باشـە بـۆ فکـر لـەحاڵی ئـەو ناکەیتـەوە، باشـە ئـەو کابرایـە ڕۆیـشت ئەگـەر تۆبەیەکی نەکردبێ ئەوا مردوو فەوتاوە، خـۆ ئەگـەر کارێکی چاکی لەگـەڵ خۆی نەبردبێ فەوتاوە، باشە بۆ فکر لەحالی خـۆت ناکەیتـەوە ئـەو ڕۆیـشت بـاتۆ نەفـەوتێی، سبحان الله نـەخێر ئـەم حالەتـە مـان نیـە، جالـە هـەمووی سەیرتر وەکو ئـەوەی لەسـەرەوە باسـم کـرد، مـردی ئەشـوێن ئـەوە بەچاوی

خۆمان دەبینین ئەو مردیە سەرو بن دەکەن، هەلی دەستێنەوە دای دەنـێن و هەر زۆر زۆر ئیعتیادیـە وە (الله)ی پیـاو سـالحان پـێش خۆمـان مردیـەکیان بدیتایە یەك حەفتە هەر ڕاست نەدەبوونەوە لەناو جێگا، بەلاّم ئـەو مردیـە ئەبەینە ناو قەبر دای دەنـێن بـەخۆمان بەخاکەناس خـۆلی بەسـەر سینگی دادەگەین، پاشان بەپێش ئەیپەستینەوە وادەزانین ڕادەگا، وادەزانین هەرگیز نامرین کەنەما رۆژێك لەرۆژان ڕێمـان بەوقـەبرە ناکـەوێ، جـا ڕاسـتە ئێمـە خاوەنی دڵی زیندووین، ئێمە دڵی وەجیلەمان هەیـە، نابـەخوای دلی وەجیلـە کاتێك یـەك لافیتـەی رەشـی مـردوو ئـەبینین، پێـنج دەقـە خـەیال و فکـری دەڕوا بـۆ قیامـەت، ئـای یـاالاهی ئـەوە فلان مـرد رۆژێـك دادێ ئـاوا منـیش ئـەمرم، دەچـێتە تەعزیـەك دادەنیـشی یەکـەم جـار فاتیحەیـەك بـۆ روحـی خۆی لێ دەدا دەزانێ ئەویش هەندەی نەماوە ئەویش باربکاو بمرێ، جابۆیـە لەتەعزەیەکـە دائەنیـشێ هـەتا تـەواو دەبـێ، ئـەوفکرو خـەیالی لـەوە دەبـێ حەشرو حیـسابی چـۆن بـێ کەدەچێتەوە مـالێ بـەقاقای پێکـەنین ناچـتەوە ماڵ، بەلکو دوو رکعات نوێژی تەوبەی نەسـوح دەکـا، وەعـدو پـەیمان لەگـەڵ خودا نوێ ئەکاتەوە وەعدەی بەندایەتی دووبارە ئەکاتەوە.

نــەوەکو بــەیانی خوانەخواســتە یــان هــەر ئەمــشەو (مەلەکولــەوت) بــێ لەدەرکــەی مالەکــەی بــدا، باشــە ئەگــەر (مەلەکولــەوت) هــات چــۆن ئەگەڕێتــەوە، چــۆن ئــەتوانی بیگەڕێنیتــەوە، چ ســام هەیبــەتێك هەیــە بیگەڕێنتـەوە، نـەخێر وە (الله)ی لەکـەس ناترسـێ، هـیچ قومتێـك و هێـزو دەسـەلاتێك نایگەڕێنێتـەوە، دەی کەواتـە بـۆ خـۆت ئامـادە نـەکردوە، جـا ئازایزانم ئێمـە هـیچ کاتێـك کەهـەزاران ئایـەت و نیـشانەی عەزەمـەتی خـوا ئەبیـستین، ئەبـەدەن بەخـەیالمان دانـایێ ئەبـەدەن ئامـان گـۆری، دەمابیینـە

ساحێبی دڵی وەجیلە، کاتێك زیکری خوامان کرد، کاتێك یادی خوامان کرد، ئەم دڵەمان بلەرزێ لەترسی خوا کاتێك گوێ بیستی قورئان دەبی، گوێ بیستی ووتارێك یان شتێکی باش ئەبی کەباسی خودای تێدا بکرێ، یەکسەر بائەم دڵانەمان بلەرزێ بۆ ئەوەی هەناومان بکوڵێ، بەو کوڵینەوە بەو لەرزینە شتێك بکەین بۆ قیامەتمان خۆشەویستانم، جارێکیان لەمزگەوتی شێخی چۆڵی لەهەولێر کابرایەك بۆ پرسە هات لەناو مزگەوتەکەدا دانیشت فاتحەی خوێند هێشتا نەی گوت بوو ئامین مەلەك و لەوت لەناو ئەو هەموو خەڵکە یەکسەر روحی هەڵکیشا و کابرا لەجێی خۆی مرد، کابرا هاتبو تەعزیەی برادەرێکی خۆی بکا، بەڵام نەیزانی مەلەکولەوت والەدوای دەڕوا، کابرایەکی تر لەباتاس بۆ خۆم لەوێ بووم کابراهات لەناو پرسەکە دانیشت پاش نیو سەعات لەدانیشتنەکەی کەخەڵکی هەولێر بوو، لەناو عەزیەکەدا مردوو روحی درچوو.

جا خۆشەویستانم بائێمە کاتێك نیشانەیەکی وادەبینین ئایەت و نیشانەیەکی خودا ئەبینین بابگەڕێنەوە لای خودا، حسیابی خۆمان زەبت بکەین، بۆیە حەسەنی بەصری رەزای خودای لێ بێ کاتێك چوون مردیەکیان شاردەوە لەسەر گۆڕەکەی راوەستاو فەرمووی وە (الله)ی ئەو شوێنە شوێنێکە دەبێ ئینسان حیساب و کتابی خۆی لەدونیا زەبت بکا، بەڕاستی شوێنێکە کەئینسان دەبێ فکری لێ بکاتەوە، دیمەنێکە ئەبێ لێی ورد بینەوە دیمەنێکە ئەبێ دەرس و عبرەتی لێ وەرگرین.

بەڕاستی مەشهەدێکە ئینسان نابێ لەبیری بکا، جاکاتێك کەگەڕایەوە ماڵەوە، خواردنیان بۆ هێنا فەرمووی وە(الله)ی ئیشتهای خواردنم نەماوە، دەزانی چ دیمەنێکم دیوە، دەزانی چ مەشهەدێك و فەزاعەتێکم دیوە، سبحان الله یەك

حەفتە دیمەنی کفنی کابراو چاڵی قەبرەکەی لەیاد نەدەچوو، بەڵام کە ئێمە دەگەڕێنەوە هەر ئەو دەقەیە لەبیری دەکەین، جاخۆزگە بمان توانیبایە بەو سیفەتەی دڵی وەجیلەیە خۆمان بە خوای گەورە جوان بکردایە خۆشەویستانم دڵی وەجیلە ئەوەیە کاتێك عەزمەتێکی ئەو عەزیمەو ئەو ئیلاهە ئەبینی و ئەبیستێ، یاخود ئایەتێکی خوای گەورەی گوێ لێ دەبێ یاخود خوای گەورە بەبیربێتەوە، کە بەبیری دێتەوە ئەلەرزێ و دەگەڕێتەوە و تۆبەدەکاو داوای عەفوو لە رب العالمین دەکاتن، جاخۆشەویستانم دڵێکی تر لەو دڵانەی کەوا خوای گەورە مەدحی کردوونە، هەروەها دڵێکی سپیە و بەشێکە لەدلەسپیەکان دڵی مربیطة ئەم دڵە بۆ پێی دەڵێن دڵی مربیطة لەبەر ئەوەی ئەو دڵە دامەزراوە وئە باتی هەیە لەبەرامبەر هەر هێرشێکی لەشەهەوات و شوبهات و لەشەیتان کەلەبۆی دەهێنن سبحان الله ئەم دڵە دامەزراوە نالەرزێ هەتا لەکاتی شەڕدا لەگەڵ کافرانیش لەخەبات و جیهاد ئەم دڵە زۆر دامەزراوە، بۆیە خوای گەورە وەسفی دەکا دەفەرموێ ﴿وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ الانفال/١١، واتە: خوای گەورە کەلەکاتی شەڕی بەدردا ئێمە بارانمان بەسەر ئێوەدا باران چونکە موسلمانەکان ژمارەیان کەم بوو لەشەڕی بەدردا لەشکری کافرەکانیش زۆر بوون موسلمانەکان ٣١٣ کەس یان ٣١٤ کەس بوون، کافرەکانیش نزیکەی هەزار کەس بوون لە ٩٥٠ هەتا ١٠٠٠ کەس دەبوون، جاموسلمانەکان خۆیان بەکەم دەزانی ئەتۆ دەبینی جەیشێکی ئاوا زۆر بەرامبەرت حەتمەن لەمەعنەویاتیان تەئسیر دەکاو ترس ئەنیشێ لەدڵدا، دڵت ئەلەرزێ و ئینسان مەعنەویاتی دێتە خوار بەڵام خوای گەورە بۆ ئەوەی موسلمانەکان مەعنەویاتیان بەرز بێ دڵیان دامەزراو بێ، چەند نازو

نیعمەتێکی پێ بەخشین، یەك لەوانە دەیان دیت کافرەکان گەلێك کەمن بەخۆیان گەلێك زۆرن، کافرەکان بزەبت وایان دەدیت بەخۆیان گەلێك زۆرن و موسلمانەکان کەمن بۆ؟ چونکە خوای گەورە ئیشی بەو شەرە هەبوو بۆ ئەوەی حەق و باطل لێك جودا بێتەوە ﴿لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ﴾ الانفال/٨، خوای گەورە ئیشی بەو شەرە هەبوو بۆ ئەوەی حەق و باطل لێك جودا بکرێتەوە، رابگەیەنرێ ئەمە حەقەو ئەوەش باطلە وە پاشانیش خوای گەورە بارانی بۆ ناردنە خوارێ بۆ ئەوەی زۆربەیان ئیحتلامیان بوو، زۆر وەزعیان ناخۆش بوو و شەرمیان دەکرد بەم ئیحتلامە بچنە شەڕێ و چۆن بەخزمەت خوای گەورە بگەن و شەهید بن، جا ئەوە بوو خوای گەورە بارانی بۆ ناردنە خوارێ، ئەم بارانە چەند خێرێکی هەبوو یەکەم خۆیان پێ شووشت، دووەم بن پێیان لم بوو لمیش ئەگەر بارانی لێ بدا هەندێك توند دەبێ ﴿وَيُثَبِّتَ بِهِ الأَقْدَامَ﴾ الانفال/١١، جا خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ﴾ الانفال/١١، بەڕاستی دڵی دامەزراند ، خوای گەورە دڵی ئەو موجاهیدانەی دامەزراند، جادڵی دامەزراو دڵێکە لەهیچ هێرشێك ناترسێ باهێرشی شبوهات و شەهەوات و شەیتاننەکان بۆی بێن ئەم دڵە دامەزراوە مەزبووتە، ئیمامی شەوکانی دەفەرموێ دڵی مربطة ئەو دلەیە ﴿صابرة و قویة و ثابتة﴾ دەفەرموێ دڵێکی بەسەبرو بەقوەت و جێگیر و نەگۆڕو دامەزراوە، کە تەماشای سیرەی پیاو سالحەکان دەکەیت، دەبینین نموونەمان زۆرە لەو دڵانەی کەدامەزراوە کاتێك شەیتان و شبوهات و شەهەوات هجومیان بۆ کردوە، تەماشاکە سولیمانی کوڕی یەسار یەك لەپیاو سالحەکانەو یەك لەگەنجەکانە لەگەنجەکانی شاری مەدینەی پیرۆز دەبێ، ئەم کوڕە گەنجە زۆر موتەدەین

دەبێ زۆر ڕێك وپێك دەبێ خوای گەورە جەماڵێكی زۆر جوانی دایتێ، ئەم کوڕە گەنجە لەگەڵ برادەرێکی خۆی پێی دەڵێ بۆ نەچین عەمرەیەك نەینینەوە لەمەککە ئەویش دەڵی بابچین، بەینی مەککەو مەدینە بەسەیارە پێنج سەعاتە ئەو ڕێیە هەمووی صحرایە بەس بەردی لێیە هیچ شتی تری لێ نیە ڕێیەکی زۆر ناخۆشە، جاگوتی لەناوەندی ڕێگا بووین ماندوو بووین تەقریبەن دووسێ ڕۆژ بوو ڕۆیشت بووین ماڵمان بەجێ هێشتبوو، گووتی لەڕێگا دانیشتین ئیسراحەتمان کرد ئاوەدانیەك دیار بوو سولێمان گوتی بەبرادەرەکەم گوت ئەمن دەچم هەندێك خواردن دەکڕم پێکەوە دەی خۆین گوتی نامن دەچم، دەڵێ دووری خەڵکی دانیشتبووین، سولێمان بۆ خۆی دەیگێڕێتەوە دەڵێ خێمەیەك لەدوور دیار بوو، گوتی ئافرەتێکی خیماری پێچەی لەچاو بوو هات کەچاوی بەسولێمان کەوت دیتی گەنجێکی زۆر جوانە ئافرەتەکەش پێی ئیفتیتان بوو لەپێشی دانیشت و پێچەکەی هەڵداوە سبحان الله ئافرەتێك بوو پارچەیەك بوو لەمانگ، ئەوەندە جوان بوو گوتی داوای لێ کردم شتێکم بدەنێ، ئەویش وەی زانی فەقیرە داوای خواردن دەکا چوو هەندێك نانی ڕەقی دایێ ، گوتی ئەوەم ناوێ گوتم چیت دەوێ گوتی ئەوەی ژن و پیاو پێکەوە ئەنجامی دەدەن ئەمەم دەوێ، ئەویش گوتی لەخوا بترسە ئەوە شەیتانە تۆی ڕازاندۆتەوە بۆمنی ناردیە، خوشکی من لەخوابترسە ئەوەچیە توشی هاتی بۆ ناچی مێرد بکەی باشترە، ئێمەش و خەڵکانیش توشی گوناە مەکە و سولێمان سەری داناو دەستی بەگریان کرد زۆر گریا، ژنەکەش هەر ئینتزاری کرد بزانی ئەو کابرایە وەکو کوردەواری گوتەنی (دڵی مردیە) هەستاو ڕۆیشت ، کابرای برادەری سولێمان هاتەوە تەماشای کرد سولێمان چاوی سۆربۆتەوەو دەگریێ، گوتی ئەوە چیە

گوتی وه الله غەریبی منداڵەکان دەکەم گوتی نەبەخوا غەریبی منداڵەکانت ناکەی دەبێ شتێك روویدابێ من ئاگام لێ نیە گوتی نا زۆری لێ کرد بەقورئان دەبێ پێم بڵێی گوتی وە(الله)ی وەخت بوو تووشی فیتنەیەك بم، ئافرەتێکی ئاواهات و داوای شتێکی ئاوای لێ کردم، بەس خوای گەورە دڵی ثابت کردم و نەجاتی دام، برادەرەکەی یەکسەر گریا لێی پرسی گوتی باشە تۆ بۆ دەگری گوتی قورم بەسەر بۆ ئەوەی دەگریم من لەشوێنی تۆ بام تۆ بچووبای شتت بکری با کێ نەی دەگوت توش نەدەهاتم ماڵم کاول نەدەبوو! بەڕاستی ﴿وَلِيَرْبِطَ عَلَى قُلُوبِكُمْ﴾ الانفال/١١، ئەوەیە خوای گەورە ثە باتی دەداتێ بەرامبەر هێرشی شەیتان و شەهەوات و شبوهات و پارێزراو بی جا ئەو سولێمانە دەڵێ کەچووم بۆ مەککە، لەوێ تەوافم کرد شەو لەخەودا کورێکی زۆر جوانم دی، گوتی نام ناسی گوتم ناوە الله گوتی من یوسفم گوتم یوسف پێغەمبەر فەرمووی بەڵێ گوتم وە (الله)ی ئێوەو زولەیخا زۆر شتێکی سەیرتان لەبەینی هەیە گوتی وە (الله)ی تۆش لەگەڵ ئەو ئافرەتە لەڕەشماڵەکە زۆر شتێکی سەیرتان هەیە.

یارەبی خودایە ئەم دڵەمان پێ ببەخشی، بەتایبەتی لەو زروفە و لەو فەسادیەی لەو بەرەلاییەی ئێمە وابەرەو پیلی دەچین، سبحان الله زۆر پێم سەیرە ئەو هەموو فەسادیە چۆن پەیدابووە، ئەو هەموو خەڵکە شەریفانە کچەکانیان پانتۆل لەبەر دەکەن، خۆزگە بەرین بایە، پانتۆلەکی تەسك پیاو شەرم دەکا لەبەر بکا وە (الله وبالله وتالله) پیاو شەرم دەکا ئەو پانتۆلەی ئافرەتەکان لەبەری دەکەن پیاوەکان لەبەری بکەن، من نازانم بەچ شێوەیەك گۆڕان کوا غیرەت و کوا شەهامەت کوا مروئەتو پیاوەتی و ئەخلاق و ئیمان کێ وە چوونە کوا فەزیلەت کواپاکی و بەرزی و خاوێنی

نـازانم ئـەو ووشـانە هـەمووی کرانـە نـاو زەبالـەی، کـوان ئـەو بنەماڵانـەی ئیفتخاریان بەشەرەف و ناموس دەکرد کوا ئەو دینەی ئینسان کە فەخرمان پێ دەکرد، کـوا ئـەو ناموسـەی کـە ئـەو خەڵکـە یـەك تـۆز تـەنازلی نـەدەکرد لەبەر بەرزی ناموسی، کوان کێـوە چـوون هـەموویان فـەوتان وە (الله)ی پـێم سـەیرە ئـەو باوکـە دەڕوا دووکـچی لەگەڵە هـەردوو پانتۆلیـان لەبـەرە، ئـەو خەڵکە تەماشای دەکەن، ئەو باوکە تەقەی سەری دێ کەدەڵێی هـەر غیرەتـی لەلەشی دانیە، کوا ئەو غیرەتەو ئەو ئیمانە و ئەو شەهامەتە، کوا چی لێهات نازانم زۆرم پێ سەیرە، جا هەر ئەوەنـدە دەنووسـم، دوعـای بـۆ ئەوگـەنج و لاوانە بکەن کەخوای گەورە دڵیـان ثـابت بکـا، یـارەبی خودایـە پارێزراومـان بکـەی، خودایـە ئیمـانێکی پتـەویان پـێ ببەخـشی محفـوظ بـن لـەو جـەوە فەسادەدا، خۆشەویستانم ئەوە لەکورد ناوە شێتەوە ئەوە جـەوە فەسـادو بـێ رێك و پێکیەی بۆ ئێمە رەخساوەو دروسـتیان کـردوە، لەئێمـە نـاوە شـێتەوە بەس نازانم ئەو تەقلیدەی ئێمە دەیکـەین هـەر شـتێك لەسـەتەلایت ببیـنین یەکـسەر کـچکەکانمان و کوڕەکانمـان جـێ بـەجێی دەکـەین، بەڕاسـتی ئەمـە شـتێکی ناخۆشـە ئێمـە پێویـستمان بـەدڵێکی مـربـط هەیـە، بەڕاسـتی ئـەم دڵانەی خۆگرن بەرامبەر ئەو هەموو جـەوە فەسـادەی ئـەو هـەموو هجومی شـەهوات و شـەیتان کـەبۆ کوڕوکـچە گەنجـەکان هێـرش دەکـاتن جانموونـەم زۆرە انـشاء الله لەدەرسـێکی تـر بۆتـان بـاس دەکـەم، تادەرسـێکی تـر بـەخۆی گەورەتان دسپێرم .

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين ، والصلاة والسلام علي خير خلقه محمد وصحبه أجمعين، السلام عليكم ورحمة الله وبركاته ..

ئـازیزانم لەدەرسـی پێشوو هاتینـە سـەر دڵـی مربطـه، گوتمـان ئـەو دڵەیـە کەخوای گەورە دای مەزراندوە ، ئەو دڵە ثابتە لەبەرامبەر هـەموو هێزێکـی شەهەوات و شـەیتانی، ئـەو دڵـە خـوای گـەورە ئیمـانێکی وای پـێ بەخـشیەو خەلات کردوەو بەڕاسـتی نـابزوێ و حەرەکـەت ناکـات و نـەجاتی دەبـێ، جـا حەقیقەتـەن ئێمـە لـەزروفێکی ئـاوا دەژیـن، پێویـستمان بـەو دڵانـە هەیـە، بەڕاستی دەبێ ئێمە بۆ گەنجەکانمان و کچەکانمان و خوشکەکانمان ئـەم دڵـە دروست بکـەین، بتـوانین، هیمـەت بکـەین، ئـەم دڵـەیان پـێ ببەخـشین دوعـا بکـەین و لـەخوا بپارێینـەوە کـە خـوای گـەورە یارمـەتیمان بـدات، دڵێکـی ئاوایان بۆ دابمـەزرێنی، بـۆ ئـەوەی بتـوانین بـژین لـەو زروفـەدا ئـەم دڵـەش بەپەروەردەکردن دروست دەبـێ، بەتەربیـەت دروسـت دەبـێ بـەڵام هەرچـی، **یەکـەمین** بەتەربیەتـەکی ئیمـانی مـەزبووت ئـەم گەنجانـەی ئێمـە بـەکچ و بـەکوڕەوە بەڕاسـتی ئەوانـە دەبـێ تەربیـەت بـدرێن بەتەربیـەتێکی ئیمـانی، دەبـێ خـەوفی خوایـان لەدڵـدا بروێنـدرێ، دەبـێ هەیبـەت و عەزەمـەتێکی خـودای عـەزیمیان لەدڵـدا بروێنـدرێ، دەبـێ شـەرمەزاری ڕۆژی قیامـەت و ناخۆشی مەحشەریان لەدڵدا بروێنـدرێ، بـۆ ئـەوەی بتـوانین بـەو یەقینـەوە مەواجەهەی ئەو هـەموو فەسـادیەو بێ ئەخلاقیـەی بکـەن، خۆشەویـستانم ئێـستاش هەرباشـە بـەڵام غـەمی چـەند سـاڵی دیکـە دە، بیـست سـاڵی دیکـە، نازانم وەزعی ئەو خەڵکە چی لێدێ، هەر خوا ئەزانێ ئەگەر وەزع ئاوا بڕوا

خەڵك ئاوا دەستی لەخۆ بەردا، ئاوا خەڵك دەست لەناموس وشەرەف و کەرامەتی خۆی شلّ بکات و بە جواب نیّ، تەنها خودا لوتف بکا بەگەنجەکانمان، خودا روحم بکا بەخوشك و دایکە کانمان و کچەکانمان، جا بەڕاستی ئێمە دەبێ بەو تەربیەتە ئیمانیەی، دەرسی ئیمانی دەرسی عەقیدەی ئیسلامی ئەوە زۆر موهیمە بیرو باوەڕی ئیسلامی، لەدلّی ئەم کوڕو کچانە بچیندرێ و ثابت بکرێ بۆ ئەوەی دلّێکی مربطیان بۆ دروست بێ، لەکاتی ئەو شەهەواتەو ئەو شەیتانە هجومەی بۆ دەهێنن ئەو ئینسانە پارێزراو بێ و هێزو توانای وای پێ بدا کە ڕەدی بداتەوە، وە پاشان تەوفیقی رب العالمین لەبۆ ئەو کەسەی بنێری ئینجا دەبێ ئەم لەسەر ئەخلاقێکی ئیسلامی ڕەسەن و ڕێك وپێك پەروەردە بکرێ.

دەبێ فێرە پاکیان بکەین، فێرە نەزاهەتیان بکەین، فێرە خاوێنی و داوێن، پاکیان بکەین و پاشان دەبێ پێیان بلّێن ئێمە خاوەن مروئەتین، چ پیاو چ ئافرەت خاوەن مروئەتە خاوەن شەهامەتە خاوەن غیرەتە خاوەن ئیمانە.

ئەگەر بێتو لەدونیایێ خۆی محفوظ نەکرد، خۆی نەپاراست بەڕاستی ئابڕوی دەروا، جا چ کچ چ کوڕ هەردووك ئابڕویان دەڕوا شەهامەت و مروئەتیان دا ئەبەزی و دەفەوتێت، بەڕاستی ئەگەر ئێمە توانیمان لەخیلالی ئەم سێ شتە گەنجەکانی خۆمان و خەلّکی دەوراو پشتی خۆمان پەروەردەکرد و لێمان حالّی کردن و فێرمان کردن و تێمان گەیاندن، بەڕاستی ئەوانە ڕێك و پێك دەردەچن و خوای گەورە بەتەوفیقی خۆی دلّێکی مربطیان دەداتێ، ئەتوانن بەو دلّە مقاوەمەی هەر هەموو فەسادیەك و بێ ئەخلاقیەك بکەن، خۆشەویستانم ئەم دلّە ئەگەر ئەبێ ئەو بخانە زۆر زەحمەتە بگەرێنەوە بەچ دەگەڕێنەوە، برای بەڕێزم سیدی لەبازار

دەفرۆشن دەڵێن دوامادەی شەو بەچوار دینار، کەدیارە ئەم سیدیە ئەو پەڕی بێ ئەخلاقی و بەرەڵایی تێدایە، باشە ئەو کوڕەگەنجە ژنی نەهێناوە، ئەوەی ژنیشی هێناوە هەر لەوان خراپ تر، باشە چ شتێك هەیە ئەو کوڕە گەنجە بگەڕێنێتەوە لەبێ ئەخلاقی، ئیلا ئەم دوو شتەنەبێ ئیمانێکی دامەزراو و ئەخلاقێکی رەسەنی جوان و رێك و پێك و دڵێکی مربطی دامەزراوی ثابت، ئەگەرنا چ شتێکی تر هەیە ئەو گەنجە بگەڕێتەوە، ئەو کوڕە گەنجە سەتەلایت دەکاتەوە دەبینی شازدە قەنات لەدوو یەك بێ ئەخلاقیە، کاکی من ئەو گەنجە چ هێزێك هەیە بیگەڕێنێتەوە، تەنها هێزی ئیمان و یەقین و عەقیدەی ئیسلامی، لەهەمان کات ئەوەی لە سەتەلایت ئەبینێ و لەدەرێش دەیبنن، جا خۆشەویستانم بەڕاستی زۆر ترسناکە ئەو گەنجانە بەهانایان دانەچین بەڕاستی خەتەرە ئەم کوردە فوربەسەرە توشی ئایدز بێ، بەڕاستی کارەساتە ئێمە لەناو کورد دا نەخۆشی ئایدزمان لەناو پەیدا بێ، چونکە هەر بەپاکی و بەنەزیهی و بەخاوێنی و بەشەرەف و بەکەرامەت و بەناموس ناسراوە، خۆشەویستانم کورەگەنجێکی خاوێن وەکو ئەو کوڕە کوردە گەنجانەی خۆمان، ئەم کوڕە گەنجە کاسبی ئەکا لە کوڵانان عەرەبانەی پێیە ئەگەڕێ، بزانە چ ئەفرۆشێ ئافرەتێکی نارێك و نابەجێ دەڵی وەرە ئیشێکم پێتە ئەی باتە ژووری.

دەیباتە ژووری ئافرەتەکە دەرگای پێ وەدەدا، دڵێت دەبێ ئەو ئیشەم لەبۆ جێ بەجێ بکەی، ئەویش دەڵێ لەخوابترسە خوشکی بەڕێزم، وەکو خوشکی خۆم و دایك تەماشات دەکەم، گوتی نەخێر شتی ئەوهانیە بەخودای ئێستا ئەوەی پێت دەڵێم جێ بەجێی نەکەی، هاوار دەکەم، ناموسیشت دەبەم و حەیاشت دەبەم هاوار دەکەم، هەموو خەڵك دێن هەموو دەڵێن تاوانی

کابرایـه، کـابراش پەرێـشان دەبـێ فکـر دەکاتـەوە، دەڵـێ بەڕاسـتی ناموسـم دەچـێ، بەڕاسـتی شـەرمەزار دەبم زۆر وەزعـی تێـك دەچـێ خـوای گـەورە مەددی و یارمەتی خۆی لەگەلیەتی، ئەو کوڕە گەنجە خاوەن دڵێکی مربطە خاوەن ئیمانێکی دامەزراوە خاوەن ئەخلاقێکی ڕەسەن و جوانە چۆن خـوای گـەورە پـشتی بـەردەدا ﴿ ان الله یـدافع عـن الـذین آمنـوا ﴾ خـوای گـەورە لەهەموو کاتێك دا ئەوانەی ئیمانداری حـەقیقین، خـوای گەورە دفاعیـان لێ دەکـاو لـەو مەئزەقـەدا نەجـەتیان دەداتـن سـبحان الله خـەیالی لـەبۆ دێ و دەرێتە ئافرەتەکەی باشە هەرچی دەرێـی بەسـەر چـاوان، بـەڵام رێـم بـدەی هەتا دەست بەئاو دەگەیەنم، ئەویش دەڵێ باشە کـوڕە گـەنج، هـەموو لەشـی خـۆی بەپیـسای دەکـا کەدێتـە دەرێ بـۆ نێکـی زۆر ناخۆشـی لێ دێ یەکـسەر ئافرەتەکە لووتی خۆی دەگرێ، دەڵێ ئەوە چیت کردیـە، دەڵـێ چیم کردیـە ئەم زانیە هەموو لەشم بەپیسای بووە، یەکسەر دەرگەی دەکاتەوە پالی پێـوە دەنێ دەڵێ ئـەی پیـسی ناشـرین مـن بـۆ چ بـانگم کـردی، خـۆت چ لێ کردیـە کـەدوور دەکەوێتـەوە بەئافرەکـەی دەڵـێ خوشـکی بـەڕێزم خـودا هیدایـەتی هەردووکمان بدا، خودا لەگوناهمان خۆش بـی، بـەڵام دەچـتەوە مـاڵێ جـوان خـۆی دەشـوا، بـەڵام ئـەی هێـشت بەپیـسی ئـەو لاشـەی پـیس ببـێ چـونکە بـەئاگری نەبوایـە لێ نەدەچـوو، جـا خۆشەویـستانم بەڕاسـتی دەبـێ ئێمـە گەنجەکانمان ئاوا تێبگەیەنین ئەو پیستەیان پیس نەبێ، بـە پیـستی حـەرام بکەوێ بەخوا بەئاگر نەبێ لاناکەوێ بە سوتانی جەهەنەمی، نـەبێ لاناچێ، باخۆمـان بپـارێزین بـا ئـەو پیـستە جوانـەمان محفـوظ بکـەین لـەئاگری جەهەننـەمی خۆشەویستانم گەنجێکی زۆر بەدین و رێك و پێك لەگـەڕەکێك دا دەژیـا، دووسـێ ئـافرەتی خـراپ هـەبوون لەگـەڕەك مـەرەقیان بـوو ئـەو

گەنجە هەڵ بخەڵەتێنن رۆژێکیان مەجموعەیەکیان کۆبوونەوە، گوتیانە ئافرەتێکی زۆر جوان، ئەم کورە گەنجە لەرێگا لابدەی هەڵی بخەڵەتێنی توشی گوناهی بکەی ئەوەندەت دەدەینێ ئافرەتەکە خەنی بوو گوتی باشە دەچم، کورە گەنجەکە لە مزگەوتەکە هاتە دەرێ، ئافرەتەکە عەبایەکی بەخۆدا دابوو هیچی لەژێرەوە لەبەر نەکردبوو، ئەو کاتەی گەیشتە بەرامبەر کورە گەنجەکەی جێگایەکی پەنابوو یەکسەر لەشی خۆی پێ نیشان دا ئەویش تەماشایەکی کردو چاوی داخست گوتی سبحان الله خوشکی من، توخوا حەیف نیە ئەو لەشەی تۆ بەئاگر بسوتێ تو خوا بۆ لەحاڵی خۆت فکر ناکەیتەوە لەناو قەبر ئەولاشەی تۆ هەموو کرم دەی خۆن، ناو چاوت ناو گوێ و ناو لووت هەموو ئەو رومەتە جوانانە هەمووی دەخۆن بۆ فکر ناکەیتەوە رۆژێك لەقیامەت دا بەزەلیل و شەرمەزاری و بەمل کەچی خوای گەورە زیندووت دەکاتەوە، ئافرەتەکە دەستی بەگریان کرد سبحان الله گریا ...گریا لەسەر دەستی ئەم کورە گەنجەی تەو بەی کرد، جا خۆشەویستانم ئەم دلآنە دەتوانن مقاومە بکەن، ئەم دلآنە دەتوانن بەرەنگاری ئەو فەسادو بێ ئەخلاقیەی ببنەوە، خۆشەویستانم بەڕاستی گەنجی ئێمە پێویستیان بە ئەو دڵە هەیە بەو پاکیە و خاوێنی و رێك و پێکەی هەیە، انشاء الله محاولە بکەین هەموومان یارمەتی یەکتر بدەین بۆ ئەوەی بتوانین، دڵێکی مربیط لەوەزعێکی ئاوا دروست کەین بۆ ئەوەی پارێزراو بین، بەردەوام دەست بەدوعا لە بۆ ئەو گەنج و شەبابەنەی کە لەخاریجن دەڵێین خوایە محفوظمان بکەی یاالله لەو جەوەدا نەباب نەبرا نەکەس و کار دیار نیە نەخزم و نەعەشیرەت کەس دیار نیە، باشە ئەو هەموو ئافرەتانەو لەوێش زۆر ئاسانە، زۆر شتەکی طبیعیە رابواردن

لەلایەن ئەوگەنجانە چ شتێك هەیە محفوظیان بکا، ئیلا دڵێکی مربط نـەبێ لەودڵـەش ئیمـانێکی ثابـت هـەبێ، پاشـان خـاوەن ئـەخلاقێکی رەسـەن بـێ، بەڕاستی ئەوانەن مقاوەمەی فەساد دەکەن، دەنا هیچیکە نیە دەبێ ئێمە بـۆ ئەوگەنجانە دوعا بکەین، هەندێ گەنجیش دەبینن تەمەنا دەکەن لـەوێ بـن، بابەگیان وامەڵێ کێ دەڵێ تۆ لەوێ بی ئیمـان و دینیـشت نەدەفـەوتا، بـەلکو هەزار حەمدو سەنا بۆ خوا کەنەچووی، نەکەوتیە ناو کافران ئەگەر تۆزێك فکر لەپارە دەکەیتەوە، وە (الله)ی ئەوەی هـی تۆیـە هـەر ئیتـوە لـەوێ بـی و لێرەبی، هەر خوای گەورە دەتداتێ، بەڵام خـەڵك قەناعـەتی نـەماوە، نـازانی (الله) رازقـەو هـەر رزق بەدەسـتەویە ، جاخۆشەویـستانم بـا دوعـا بـۆ ئـەو گەنجانە بکەین کە لەدەرەوەی وولاتن خوای گەورە محفوظیان بکاو پارێزراو بن انشاء الله.

دڵێکی تر لەو دڵانـەی کەبەڕاستی پێویـستی بەدیراسـە کـردن هەیـە، خـوای گـەورە مـەدحی کـردووە، دڵـی مخبیتەیـە، بەڕاسـتی ئـەم دڵـە متەوازعـە ملکەچـە بەرامبـەر خـوای گـەورە هـەتا لـەژیانی رۆژانەشـیدا ئـەم دڵـە زۆر متەوازعە بۆیە خوای گەورە وەسفی ئەم دڵە دەکا دەفەرموێ ﴿ فتخبـت لـە قلوبهم﴾ خوای گەورە باسی ئیمان داران دەکـا دەفـەرموێتن، ئەوانـەی ئێمـە زانـستمان پـێ بەخـشیون ئیمـانێکی یـەقینیان هەیـە بـەقورئان و بـەو راستیەیی پێغەمبەر ﷺ هێنایتی و پاشان کەئیمانیان پێ هێناو بڕوایان پێ هێنـا، ئێمـە دڵێکـی زۆر متـەوازع و رێـك و پێکیـان پـێ دەبەخـشین، جـا ئـازیزانم ئـەم دڵـە بـەئیمان بەدەسـت دەکـەوێ، کاتێـك ئینـسان ئیمـانی بـە قورئان و ئیمانێکی دامەزراوی رێك و پێکی بـەقورئان هێنـا، سـەد لەسـەدی

ئەوانـەی لـەقورئان داهـاتووە هـەمووی تـەواوە، بەڕاسـتی خـوای گـەورە ئـەم دڵەی بەقسمەت دەکا.

دڵێکی مخبیت ئەم دڵە زۆر خاشیعە، سیفەتی ئەم دڵە ئەوەیە زۆر خاشـیعە، ئەم دڵە کاتێك قورئانی گوێ لی دەبێ، زیکری گوێ لێ دەبـێ خـشوع دەیگـرێ و پاشـان سـەکینەتی دەبـێ، چـونکە سـەکینەتی خـودا دائەبـەزیی بەسـەر دڵەکانیـدا، پاشـان هـەموو فەرمانـەکانی خـوای گـەورە جـێ بـەجێ دەکـاتن, ئامادەیە لەبۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ئەوامرانەی خـوای گـەورە ئـەمری پـێ دەکات ، یان ئەو شتانەی  خـوای گـەورە نـەهی لێ دەکـاتن، جـا ئـەو شـتانەی خوای گەورە ئەمری پێ دەکا، بەڕاستی جێ بەجێ دەکـات و ئەوانـەی نـەهی لێ دەکـا ئـەو موسـلمانە ئـەو خـاوەنی ئـەم دڵـە خـۆی لێ دەپـارێزی بـەڵام سـیفەتی هـەرە سـەرەکی ئـەم دڵـە ئەوەیـە کـە متەوازعـە چـونکە (مخـبط المنخفض من الارض) واتە ئەو شوێنەی نزم بێ لەزەوی پێی دەڵێن متخبـت، واتە ئەم دڵـە زۆر متەوازعـە بەرامبـەر خـوای گـەورە، بەرامبـەر پێغەمبـەر ﷺ و بەرامبــەر خــەڵکی هــیچ تەکـەبوری لەدڵـدا نیـە، ئـازیزانم تەکـەبور نەخۆشیەکی دەروونیە ناو دڵی ئینسان، لەدڵدا تەکەبور دروست دەبێ، کاکـە تەکـەبوور لەسـەر چ لێ دەدەی ئـەم تەکـەبوورە لەسـەر چ لێ دەدەی، ئـەوەی لێی دروست بووی هـەمووی قوڕئـاوە و زیـاتر نیـە، خـۆ لەمەعـدەنێکی تـر دروست نەکراوە، خۆ لەلەزێروزیو دروست نەکراوە هەمووی قوڕئاون، دەی کەواتە ئەو ئیفتخارو ئەو تەکەبوورە لەبەرچی.

ئەگـەر بـەماڵی دونیایـەش تەکـەبوور لێ دەی، کامــە ئینـسانی بـێ قیمـەت ئەویش پارەی هەیە، کامە ئافرەتی رەزیل و پیس ئەویش پارەی هەیە، دەی کەواتە ئەو تەکەبورە لەبەر چی، ئازیزەکەم تەکەبوور لەبەر چی لێـدەدەی،

واتە خۆت زۆر پێ گەورەیە، نازانی ئەوەندە لە پێش چاوی بێ قیمەتە و کەمتر دێتە پێش چاوی خەڵکی، چەند خۆت بەگەورەتر بزانی، ئەوەندە لەپێش چاوی خەڵکی بچوك دەبیەوە، وەکو ئەو تەیرە وایە کەچەند بڵند بێ ئەوەندە بچوك دەبیتەوە، خۆشەویستانم دڵی موخیت هەرگیز خۆی بەزل نازانێ لەبەر چی؟ چونکە ئەترسێ لەرۆژی قیامەتێ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت ئەو کەسانەی لەدونیایێ تەکەبوور لێ دەدەن، لەرۆژی قیامەتێ خوای گەورە لەسەر شێوەی مێرووستان زیندوویان دەکاتەوە لەژێر پێی خەڵك، خۆشەویستانم تۆ ئەو مەوقفە بێنە پێش چاوی خۆت ئەو هەموو خەڵکە دی٘و دەڕوا قاچیان لەسەر سەرت دائەنێن ئەوەندە بچوکی لەچاو خەڵکی، ئەوە سزایەکەیتی کەلەدونیا خۆی بەگەورە دەزانی و لەقیامەتێ دەبێ ئاوا زەلیل و زەبوون بن لەبن پێی خەڵك هیچ وەزنێکیان بۆ دانە نێت چونکە خۆیان بەگەورەتر ئەزانی لەخەڵك.

دەی کەواتە ئەو تەکەبورە لەسەر چ لێ دەدەی، خۆشەویستانم دڵی مخبت دڵێکی متەوازعە بەخوا نانی لەگەڵ فەقیران دەخوا، دەستی فەقیران ماچ دەکا و هاموشۆی فەقیران دەکاو لەمەجلیسی دادەنیشێ زۆری پێ ئاساییە هەموو شتەکی لەدەست دەگرێ، هەموو شتەکی دەخوا تەکەبوری نیە، هیچ شتی بەدڵ دا نایێ کە تەکەبوور و فیزی بەخۆی بێ، جا بەڕاستی ئەم دڵە نیعمەتێکی خودای گەورەیە هەرکەسێك توشی ببێ ئەم دڵە متەوازعە، جێگەی نووری خوای گەورەی تێدا دەبێتەوە، چونکە دڵی موتەکەبر شەڕ لەگەڵ خوا دەکا، پاش شرك دوو گوناه هەن ئینسان دەفەوتێنن یەکەم ریبا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿فأذنوا بحرب من الله﴾ ئەو شەڕ دەکا لەگەڵ خوا، و دووەمیش تەکەبوور سبحان الله ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ

(لايدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من الكبر) يەك مسقالە زەرە تەكەبور لەناو دڵت بێ ناچێتە بەهەشت، ئەی هاوار وە (الله)ی هەموومان فەوتاوین ئاگامان لەخۆمان نیە، هەموومان تەكەبورمان هەیە دەڵێن ماموٚستا من هیچ تەكەبوورم نیە، باشە خوٚت تاقی بكەوە بزانە ئەگەر هەزارێك هات دەستی لەناو دەستی نای ئایە تاج رادەیەك خولقت هەیە لەگەڵی بی، كابرایەكی دەولەمەندیش هات لەگەڵت بێ بزانە فەرقیان پێ دەكەی، كە فەرقت پێ دەكرد بزانە توٚ كبرت هەیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ روٚژێك ئافرەتێك شیری دەدا بەمنداڵەكەی، كابرایەكی فەقیرو غەریب بەوێ داهات، فەرمووی یارەبی خودایە ئەم منداڵەم ئاوا لێ نەكەی، منداڵەكەش سبحان الله یەك لەوانەبوو بەمنداڵی قسەی كردوە دەمی لەشیرەكە كردەوە فەرمووی نادایكە و مەڵێ، خوایە وەكی وەم لێ بكەی دایكی زوٚری پێ سەیر بوو كە ئەو منداڵە قسەی كرد، فەرمووی هەندێكی تری پێ چوو كابرایەكی موتەكەبور سواری ئەسپ بوو بەفەخرەوە دەروٚیشت دایكەكە گوتی یارەبی خودایە منداڵەكەم ئاوا لێ بكەی منداڵەكە دیسان دەمی لەشیرەكە كردەوە، گوتی نادایكە خوایە ئاوام لێ نەكەی خوٚشەویستانم وە (الله) تەكەبوور هیچ نیە، ماڵ وێران كردنە لەبەر ئەوەی خوای گەورە لەفەرموودەیەكی قودسی كە پێغەمبەر ﷺ دەگێرێتەوە (التكبر إزاري والعظمة ردائي) واتە خوا دەفەرموێ تەكەبورو گەورەیی جلو بەرگی منە، دەفەرموێ هەر كەسێك مونافەسەم بكا لەو دوو شتە پشتی دەشكێنم و دەیخەمە ناو ئاگری جەهەنەم بەراستی تەكەبوور لایەقی (الله)یە، هەر ئەو زاتە پاكە تەكەبوری لێ دێ، بەراستی ئینسان هی ئەوەی نیە تەكەبوور لێ دا.

تەماشای خۆت بکە بزانە چیت لەناو هەناویە، بزانە تۆ دوو جاران بـەبۆڕی میز هاتیە دەرێ تەکەبوور بەچی لێ دەدەی چ دەخۆی و چ فرێ دەدەی، دڵی سیفەتی وایە هەرگیز لێ ناگەڕێ تەکەبوور بکەوێتە ناو دڵی، چونکە دەزانی ئەگەر تەکەبوور بکەوێتە ناو دڵی لەقیامەت ماڵی کاول دەبێ.

کۆتـایی دڵ لەدڵـە سـپییەکان، دڵـی خاشـیعە، یـارەبی خودایـە ئـەم دڵـەمان بەقسمەت بکـەی، دڵـی خاشـعە دڵێکـە زۆر خـشوعە بەرامبـەر فەرمانـەکانی خودا ئەوەتە خودای گەورە بۆ خۆی مـەدحی دەکاو دەفـەرمووێ ﴿ الم یـأن للذین آمنوا ان تخـشع قلـوبهم لـذکر الله ومـانزل مـن الحـق ﴾ تەماشـا خـوای گەورە دەفەرموێ ئایا وەختی ئەوەی دانەهاتوە کـە ئـەو کەسـانەی ئیمانیـان هەیە ئـەو کەسـانەی بروایـان هەیـە، دڵیـان بترسـێ لەترسـی خـوا کـە دڵیـان خاشع بێ و ملکەچ بێ بەرامبەر فەرمانی خوا ﴿ ومانزل من الحق﴾ بۆ ئەو شتانەی کە خوای گەورە رەوانی کردیـە لـەقورئان و لەئایـەتی خـوای گـەورە ﴿ بلـی یاربنـا ﴾ وە (الله)ی وەختـی ئـەوە هـاتووە کـە دڵـەکانمان ملکەچـی فەرمانت بێت .

خۆشەویستانم دڵی خاشعە ئەم دڵە کاتێـك ئایـەت و نیـشانەی خـوای گـەورە دەبینـی زۆر خـشوع دەیگـرێ، ملکەچـی دەی گـرێ بەرامبـەر (رب العـالمین) لەبەر چی؟ چونکە ئەم دڵە کاتێك باسی خوای گەورە دەکرێ کاتێـك باسـی عەزەمـەت و هەیبـەت و ئایـەتی خـوای گـەورە دەکـرێ بەڕاسـتی خـشوع دەیگرێ، بەرامبەر ئایەتی خوای گەورە ملکەچە، بۆیە دەڵـێن جارێـك دزێـك دەچێتە ماڵێـك دزی بکـا، سـاحێب ماڵەکـە قورئـانی دەخوێنـد، بـەڵام ئێمـە دزیش بـێ ئێمـە هـەر لـەدیار سـەتەلایتینە دانیـشتوی بۆیـە نـاوێرێ بێنـە ماڵمان.

کابرای ساحێب ماڵ قورئانی دەخوێند گەیشتە ئەو ئایەتەی، وا دزەکە چاوەڕێ دەکا ساحێب ماڵ بنوێ،ئنجا ماڵی کاوڵ بکات، واگوێی لێیە ساحێب ماڵ گەیشتیتە سەر ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ألم يان للذين آمنوا ان تخشع قلوبهم لــذكر الله ومانزل من الحق﴾ ئایا کاتی ئەوەی نەهاتوە، ئیمانداران دڵیان خاشع بێ و بترسێ و لە بۆ زیکری خودا، یەکسەر دزەکە گوتی (بلی یارب) تۆبەی کردو وازی لە دزی هێنا، سبحان الله چەندەها جار ئایەتی خودامان بەسەر ئەخوێندرێتەوە، هەر گوێمان لێ نیە، کەی رۆژێك لە رۆژان ئایەتێکی قورئانی ئەخۆشی خستین، رۆژێك لەرۆژان ئایەتێك دڵی لەرزاندین و هەیبەتی ئەو ئایەتەمان لەدڵ دروست بوو هەرگیز، تەماشاکە چۆن خوای گەورە وەسفی قورئان دەکا دەفەرموێ ﴿لو انزلنا هذا القرآن على جبل لرأيته خاشعا متصدعاً من خشية الله﴾ سبحان الله ئەم شاخە هەمووی بەردی رەقە، دەفەرموێ ﴿ لوانزلنا﴾ ئەگەر هاتبا ئێمە ئەو قورئانەمان لەسەر شاخ بناردایە خوار شاخەکەنتان ئەدیت بەچاوی خۆتان ﴿لرأيته خاشعا متصدعا ﴾ دەلەرزێ و پارچە پارچە دەبوو لەترسی خودا (من خشية الله) سبحان الله ئەدی باشە ئەو هەموو ئایەتی خودای گەورە لەسەر ئێمە دەخوێندرێ بۆ نالەرزین، بۆ خشوعی خواو بۆ هیبەتی خودا و بۆ ترسی خودا ناکەوتە ناو دڵی، خۆ شەویستانم دڵمان مردوە، بەڕاستی دڵی زنیدوو کاتێك ئایەتێکی ئەبیستی دەلەرزی ئەرم دەبێ خشوع دەیگرێ و لەخوا دەپاڕێتەوە کە خوای گەورە ئەی سوتێنێ بەئاگر، ئەگەر بێتو ئایەتی رەحمی بیست یان ئایەتی عەزاب، ناوی خوداهات ئەرم ئەبێ یەکسەر فرمێسکی لەچاوان دێتە خوار واتە نیشانەی دڵێکی خاشع ئەوەیە کە ئایەتی خودای بیست یەکسەر کوڵانی دلەکەی تەئسیر لەچاوی دەکات، فرمێسك لەچاوانی دێتە خوارێ، جائەم دڵە هەموو کاتێك سیفەتی وایە لەبۆ فەرمانەکانی خودای گەورە، هەموو ئەمرەکانی جێ بەجێ دەکاو هەموو نەهیەکان واز لێ دەهێنێ، جا خۆشەویستانم بەڕاستی ئەمە دڵێکە ساحێبەکەی بەختەوەرە خۆزگەم بەساحێبی دڵی خاشعە.

یەك دڵی تر مابوو حەزم کرد بۆ ئێوەی خۆشەویست بنووسم، دڵێکمان هەیە پێی دەڵێن مقشعیرە، ئەو دڵە خوای گەورە لەقورئان باسی کردوە ئەو دڵە مقشعیرە ئەوەیە،

چۆن کابرایەك ئەگەر سەرمای بێت پیستەکەی گورج دەبێتەوە، هەندێك دڵ هەیە کەخوای گەورە بەمرۆڤی بەخشیوە کاتێك ئایەتی عەزاب و ناخۆشی مەحشەر باس دەکرێ و مەوقیفەکانی مەحشەر باس دەکرێن، ئەم دڵە گورج دەبێتەوە ناو یەك لەترسی خودا، لەبەر هیچ شتێکی ترنا ئەوەتە خودای گەورە دەفەرموێ ﴿ الله نزل احسن الحديث كتاباً متشابهاً تقشعر منه جلود الذين يخشون ربهم ثم تلين جلودهم و قلوبهم لذكر الله﴾ (سورەتی الزمر/٢٣)، دەفەرموێ ﴿ الله نزل احسن الحديث﴾ واتە: خوای گەورە جوانترین گوتەو وتار کەقورئانە ناردیتەخوارێ (كتابا متشابها) قورئانێکی متشابها، پاشان ﴿تقشعر منه جلود الذين يخشونه ربهم﴾ بەڕاستی دڵی ئەو کەسانە وێك دێتەوە ﴿يخشون ربهم﴾ ئەو کەسەی کەدڵیان لەترسی خوای گەورە لێدەدا ﴿ثم تلين جلودهم و قلوبهم لذكر الله﴾ وەهەم دڵیان و هەم پێستەکەیان نەرم دەبێتەوە کاتێك زیکری خودای گەورە دەکەن، خۆشەویستانم ئەم حاڵەتە چۆن دروست دەبێ ئەومرۆڤە یەکەم جار کە باسی عەزاب و هەیبەت و ناخۆشی رۆژی قیامەت دەکرێ گورج دەبێ ئەترسێ و ئەلەرزێ دواتر کەئایەتی رەحمەت دێ کە ئایەتی خۆشی دێ ﴿ثم تلين جلودهم و قلوبهم لذكر الله﴾ یەکسەر دڵەکەی و پیستەکەی نەرم دەبێتەوە (لذكر الله) چونکە ئایەتی رەحمەتی باس کرا، سبحان الله تەماشای قورئان بکە هەمووی کاتێك کەباسی عەزاب بکا باسی رەحمەت دەکا و وەکو خوای گەورە دەفەرموێ ﴿فاما من اوتي كتابه بيمينه﴾ لەدوای ئەو ﴿واما من اوتي كتابه وراء ظهره﴾ خوای گەورە لەهەموو قورئان باسی خەوف و رجای پێکەو دانایە وەعدو وەعیدی پێکەوە دانایە وەی کردیە ئەو ئینسانە هەردوو حاڵەتی تووش ببی، جا ساحێب ئەو دڵە تەبیعاتی وایە کە ئایەتی خوای گەورە باسی ناخۆشی قیامەت دەکەن زۆر حاڵەتێك و وەزعێکی ناخۆشی دێتە سەرو گرژ دەبێتەوە پاشان لەگەڵ ئایەتی رەحمەت نەرم دەبێ کەواتە ئەم دڵە هەم خەوفی تێدایە و هەم رجاشی تێدایە کەدووباڵن بەرەو خودای دەتبەن و بەبەهەشتی بەرین شادت ئەکەن..

یەك دوو نموونە دەهێنمەوە : ئیمامی عومەر خوا لێ رازی بێ رۆژێك لەنوێژی بەیانی ئەو ئایەتەی خوێند کە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ ان عذاب ربك لواقع ماله من دافع﴾

سبحان الله بیست رۆژ ئیمامی عومەر لەماڵ کەوت خەڵك دەچوونەلای لەبەر ئەم ئایەتە ﴿إن عذاب ربك لواقع ماله من دافع﴾ خوای گەورە دەفەرموێ ئەو عەزابەی کە خوای گەورە دایناوە دێ ﴿لواقع ماله من دافع﴾ کەسیش ناتوانێ بەرەنگاری بکاو پێشی لێ بگرێ، یاسبحان الله ئایەتێکی بەشدەتە لەبۆ ئینسان بەتایبەتی ئیمرۆ کە لەوەزعێکی ئاوا دادەژین، بەخوای نزیکە عەزابێکی ئاوا ﴿ ان عذاب ربك لواقع ماله من دافع﴾ بەخودای گەورە کەسیش نیە بەرامبەر عەزابی خوا خۆی رابگرێ، هەرگیز ئەگەر لافاوبێ ئەگەر بومەلەرزە بێ چی دەکەی چیت پێ دەکرێ، هیچت پێ ناکرێ دەبێ تەسلیمی خوای گەورە بی، ئیمامی عومەر هەر بۆ خۆی ئەو ئایەتەی خوێندەوە ﴿ ان تبدوا مافی انفسکم او تخفوه یحاسبکم به الله﴾ خوای گەورە دەفەرمووێ ئەگەر ئەوەی لەناو دڵتانە و ئەوەی دەیکەن خوای گەورە لە هەمووی حیسابتان لەگەڵ دەکات، سبحان الله لەخۆ چوو و بەربۆوە سەر زەوی، جا خۆشەویستانم بەڕاستی ئەوە حاڵەتی دڵی مقشعرە، کاتێك گوێی لەو ئایەتانە دەبێ کە عەزاب و تەهدیدن بەڕاستی وێك دێتەوە، هەتا وەی لێ دێ ساحیبەکەشی نەخۆش دەکەوێ، جا لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە انشاء الله خوای گەورە ئەم دڵە نەرمانەمان پێ ببەخشێ.

ئەو دڵە رێك و پێکانەمان پێ ببەخشی، جا خۆشەویستانم ئەمە هەشت دڵ لەو دڵە سپیەکان بوو هەریەکی سپی، بەقەدەر ئیمان و بڕواو ناوەکەی خۆی سپیاتیەکەی زیاترو کەمترە جا لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە لەو هەشت دلانە دڵێکمان پی ببەخشێ، تاله قیامەتێ بەروو سپی و بەخزمەتی بگەین انشاء الله لەبەر گێکی تر بەخزمەت دڵە ڕەشەکان و جۆرەکانی دەگەین و بۆتانی باس دەکەم، تا دەرسی یازدە دوعام بۆ بکەن و دوعاتان بۆ دەکەم.

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

# ناوەرۆك

